ناوی کتێب: زیکره ڕاستو دروستەکان

کۆکرنەوەو ئامادەکردنی: أبو الحسن محمد بن حسن الشيخ

وەرگێڕانی: عبدالمجيد عبدالحميد

نەخشەسازی ناوەوە: محمد علی احمد

ساڵی چاپ: ٢٠١٠ ز

ژمارەی سپاردن: (١٣٥٥)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە.

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
website: www.nareenpub.com
E-mail: info@nareenpub.com
تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)

مۆبایل: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠

# زیکره ڕاست و دروستەکان

## لە کتێبەکانی زانای فەرموودەناس

## الشيخ محمد بن ناصر الدين الالباني (رحمه الله)


وەرگێڕانی

عبدالمجيد عبدالحميد



نارین

# بسم الله الرحمن الرحيم

رب يسر ولا تعسر

## ١= أذكار طرفي النهار

## زیکرەکانی بەیانیانو ئێواران

١ـ ((أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى الْمُلْكُ لِلَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، ولاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، رَبِّ أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ، وَخَيْرَ مَا بَعْدَهَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ، وَشَرِّ مَا بَعْدَهَا، رَبِّ أَعُوذ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَسُوءِ الْكِبَرِ، رَبِّ أَعُوذ بِكَ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ، وَعَذَابٍ فِي الْقَبْرِ» وَإِذَا أَصْبَحَ قَالَ أَيْضًا «أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ»[١] . واتە: ئێوارەمان بە سەردا هاتو

---

١ /(مختصر مسلم : ١٨٩٤)

موڵکیش ئێوارەی بە سەردا هات بۆ خوای گەورە، سوپاس‌و ستایش بۆ خوا، هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت، تەنهاو بێ هاوەڵە، موڵك‌و سوپاس‌و ستایش تەنها بۆ ئەوەو توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە، پەروەردگارا.. من داوای چاکەی هەموو ئەوەی لەم شەوەدا هەیە لێت دەکەم‌و چاکەی ئەوەی لە پاش ئەو دێت، وە پەنات پێ دەگرم لە خراپەی ئەوەی لەم شەوەدا هەیەو خراپەی ئەوەی لە پاش ئەو دێت، پەروەردگارا.. پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی‌و تەوەزەلی‌و خراپەی فیززلی‌و لووت بەرزی، پەروەردگارا.. پەنات پێ دەگرم لە سزای ئاگری دۆزەخ‌و سزای ناو گۆڕ)) وە ئەگەر رۆژی بکردایەتەوە دەیفەرموو : ((بەیانیمان بە سەردا

هـاتو مـوڵکیش بـەیانی بەسـەردا هـات بـۆ خـوای گەورە).

٢ـ ((إذا أصبح أحدكم فليقل : (اللهم بك أصبحنا وبك أمسينا وبك نحيا وبك نموت وإليك النشور) وإذا أمسى فليقل : (اللهم بك أمسينا وبك أصبحنا وبك نحيا وبك نموت وإليك المصير))[1] واتـە : ئەگـەر یەکێکتان ڕۆژی بە سەردا هات ئەوا با بڵێت : (ئـەی خودایە.. بە ناوی تۆوە بەیانیمان بە سـەردا هـاتو بە ناوی تۆوە ئێوارەمـان بـە سـەردا هـاتو بـەناوی تۆوە دەژیـنو دەمـرینو زیندووبوونـەوەش هـەر بـۆ لای تۆیە) وە ئەگەر ئێوارەی بە سەردا هات ئەوا بـا بڵێت : (ئەی خودایە.. بە ناوی تۆوە ئێوارەمان بـە سەردا هـاتو بـە نـاوی تـۆوە بـەیانیمان بـە سـەردا

---

١ /(الصحيحة : ٢٦٢)

هاتو بەناوی تۆوە دەژینو دەمرینو سەرەنجام هەر بۆ لای تۆیە).

٣ـ ((اللهم أنت ربي لا إله إلا أنت، خلقتني وأنا عبدك، وأنا على عهدك ووعدك ما استطعت، أعوذ بك من شر ما صنعت، أبوء لك بنعمتك عليَّ، وأبوء لك بذنبي، فاغفر لي، فإنه لا يغفر الذنوب إلا أنت))[١].واتە : ئەی خودایە.. تۆ پەروەردگاری منی، هیچ خودایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها تۆ نەبێت، تۆ منت دروست کردوەو منیش بەندەی تۆم، لە سەر پەیمانو بەڵێنەکەم ماوم تا لە توانامدایە، پەنات پێ دەگرم لە خراپەی ئەوەی کردوەمەو ئەنجامم داوە، دان دەنێم بە

١ /(مختصر البخاري : ٢٤٢٠)

نیعمەتـــەکانت بـــە ســـەرمەوەو دان دەنـــێم بـــە تاوانەکانمدا، لـە تاوانـەکانم خۆشبە، چـونکە هـیچ کەسـێك لــە تاوانــەکان خــۆش نابێــت تــەنها تــۆ نەبێت)).

٤-((یاحي یا قیوم برحمتك استغیث ، أصلح لي شأني کله، و لا تکلني إلی نفسي طرفة عین))[1] واتە : ئەی زیندووی ڕاگرو هەڵسوڕێنەری بوونەوەر.. بـە بەزەییەکەت داوای فریاکەوتنت لێ دەکـەم، هـەموو کارەکانم بۆ چاك بکەو تەنانەت بۆ چاوتروکانێکیش مەمدەرە دەستی نەفسەکەی خۆم).

٥- ((اللهم عالم الغیب والشهادة، فـاطر الـسموات والأرض، رب کل شـيئ وملیکـه، أشـهد أن لا إلــه إلا

١ /(صحیح الترغیب : ٦٦١)

أنـت، أعـوذ بـك مـن شـر نفـسي، وشـر الـشيطان وشركه، وأن أقترف على نفسي سوءاً، أو أجـره إلى مسلم))[١] واته : ئەی خودایە.. ئەی ئەو کەسەی کـە زاناو ئاگاداری پەنهانو ئاشکرای، ئەی بەدیهێنـەری ئاسمانەکانو زەوی, پەروەردگارو پادشـای هـەموو شتەکان، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییـە شایستەی پەرستن بێت تەنها تۆ نەبێت، پەنات پـیٚ دەگـرم لـە خراپـەی نەفـسی خـۆم، وە پـەنات پـیٚ دەگرم لە شـەیتانو داوو تەڵەکـەی، وە لـەوەی کـە خراپەیـەك بهێـنم بـە سـەر نەفـسی خۆمـداو یـان بیئاڵێنم بە موسڵمانێکدا).

١ /(صحیح الکلم : ٢١)

٦- (اللهم إني أسألك العافية في الدنيا و الآخرة، اللهم أسألك العفو والعافية في ديني ودنياي، وأهلي ومالي، اللهم أستر عوراتي، و آمن روعاتي، اللهم احفظني من بين يدي، ومن خلفي، وعن يميني، وعن شمالي، ومن فوقي، وأعوذ بعظمتك أن أغتال من تحتي)[1]. واتە : ئەی خودایە.. من داوای پارێزراویت لێ دەکەم لە دونیاو لە دوارۆژدا، ئەی خودایە.. من داوای لێخۆشبوونو پارێزراویت لێدەکەم لە دینو دونیاو کەسوکارو سامانەکەمدا، ئەی خودایە.. عەیبەکانم داپۆشەو ترسو دڵەڕاوکێم مەهێڵە، ئەی خودایە.. بمپارێزە لە پێشمەوەو لە پاشمەوەو لە لای ڕاستمەوەو لای چەپمەوەو لە سەرەوەم، وە

١ /(صحيح الكلم : ٢٣ )،(صحيح ابن ماجه :٣١٣٥)

پەنا بە مەزنیو گەورەییت دەگرم لە ژێرەوە پێ بکرێم).

٧- (لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك، وله الحمد، وهو على كل شئ قدير.)[1] واتە : هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت، تەنهاو بێ هاوەڵە، موڵكو سوپاسو ستایش تەنها بۆ ئەوەو توانای بە سەر هەموو شتێكدا هەیە).

٨- (بسم الله الذي لا يضر مع اسمه شئ في الأرض ولا في السماء وهو السميع العليم) ثلاث مرات)[2]. واتە : بە ناوی ئەو خوایەی كە هیچ شتێك لە گەڵ ناوەكەی ئەودا زیان ناگەیەنێت، نە لە

---

١ /(صحيح الترغيب :٦٥٦ )، (صحيح الترمذي : ٥٠٧٧)

٢ /(صحيح الترمذي : ٣٣٨٨)

زەوی‌و نە لە ئاسماندا، ئەو خوایە بیسەرو زانایە) (سیٚ جار)

٩- اللهم عافني في بدني، اللهم عافني في سمعي، اللهم عافني في بصري، لا إله إلا أنت. اللهم إني أعوذ بك من الكفر، والفقر، اللهم إني أعوذ بك من عذاب القبر، لا إله إلا أنت)) تعيدها ثلاثاً حين تُصبح، وثلاثاً حين تُمسي.)[1] واتە: ئەی خودایە.. پارێزراوم بکە لە لەش‌و جەستەمدا، ئەی خودایە پارێزراوم بکە لە بیستنمدا، ئەی خودایە پارێزراوم بکە لە بینینمدا، هیچ خودایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها تۆ نەبێت، ئەی خودایە.. من پەنات پیٚ دەگرم لە بیٚ باوەڕی‌و هەژاری، ئەی خودایە.. من

---

١ /( صحيح ابوداود : ٥٠٩٠ )

پـــەنات پـــێ دەگـــرم لـــە ســـزای نـــاو گـــۆڕ، هـــیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت تـەنها تـۆ نەبێت) سێ جار دەیڵێیتەوە کاتێ ڕۆژدەکەیتـەوەو سێ جار کاتێ ئێوارەت بە سەردا دێت.

١٠- (لا إله إلا الله وحده لا شريك لـه، لـه الملـك وله الحمد، يحيي ويميت، وهو على كل شـئ قـدير). عـشر مـرات.)[١] واتـــە : هـــیچ پەرســـتراوێك نییـــە شایستەی پـەرستن بێت تەنها (الله) نـەبێت، تـەنهاو بـێ هاوەڵـە، موڵـكو سـوپاسو سـتایش تـەنها بـۆ ئـەوەو هـەر ئـەو زیندوودەکاتـەوەو دەمرێنێـتو توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە) (دە جار).

---

١ / ( الصحيحة : ٢٥٦٣ )

١١- (سـبحان الله وبحمـده).(مائـة مـرة)[١] واتـە : پاکیو بێگەردی بۆ خواو سوپاسو ستایش هەر بۆ ئەو. (سەد جار).

١٢- (سـبحان الله) مائـة مـرة، (الحمـد لله) مائـة مرة ، (الله أكبر) مائـة مـرة. (لا إلـه إلا الله وحـده لا شريك له، له الملك ولـه الحمـد، وهـو علـى كل شـئ قدير.) مائة مرة)[٢]. واتە : (پاکیو بێگەردی بۆ خوا) سەد جار، (سوپاسو ستایش بـۆ خـوا) سـەد جـار (خوا لە هەموو شتێك گەورەترە) سـەد جـار، (هـیچ پەرسـتراوێك نییـە شایـستەی پـەرسـتن بێـت تـەنها

١ /(مختصر مسلم :١٩٠٣ )، ( صحيح أبي داود : ٥٠٩١)
٢ /( صحيح الترغيب : ٦٥٨ )

(الله) نەبێت، تەنهاو بێ هاوەڵە، موڵكو سوپاسو ستایش تەنها بۆ ئەوەو توانای بە سەر هەموو شتێكدا هەیە) سەد جار.

١٣-(قل هو الله أحد) و (المعوذتين) (ثلاث مرات)[١]. واتە : خوێندنەوەی سورەتی (الاخلاص و الفلق و الناس) هەر یەكەو سێ جار.

١٤- آية الكرسي : (الله لا إله إلا هو الحي القيوم..)[٢]. واتە : خوێندنەوەی (آية الكرسي).

---

١ /( صحيح الكلم : ١٨ )

٢ /( صحيح الترغيب: ٦٥٨ )

## ئەو زیکرانەی کە تایبەتن بە بەیانیانەوە

١٥- (رضيت بالله رباً، وبالإسلام دينا، وبمحمد نبيا(ﷺ).)[١] واتە : رازیم بەوەی کە (الله) پەروەردگارم بێتو ئیسلامیش دینم بێتو(محمد)یش (ﷺ) پێغەمبەرم بێت.

١٦- (أصبحنا على فطرة الإسلام، وكلمة الإخلاص، ودين نبينا محمد (ﷺ) وملة أبينا إبراهيم (عليه السلام) حنيفاً مسلماً وما كان من المشركين))[٢] واته: بەیانیمان بە سەردا هات لە سەر فیطرەتی ئیسلامو وشەی ئیخلاصو دینی پێغەمبەرەکەمان محمد(ﷺ)و لەسەر میللەتی باوکمان ئیبراهیم

---

١ /( الصحيحة : ٢٦٨٦)، (الضعيفة تحت رقم : ٥٠٢٠ )

٢ /(الصحيحة : ٢٩٨٩ )، (تراجع العلامة :٢٧٠ )

پێغەمبەر (ﷺ) کە لایدابوو لە بەتاڵەوە بۆ هەق‌و موسڵمان، وە لە هاوبەش دانەران نەبوو)

١٧- (سبحان الله وبحمده عدد خلقهِ، ورِضا نفسهِ، وزِنةَ عَرشِهِ ومِداد كلماته) (ثلاث مرات)[١] واتە: پاکی‌و بێگەردی بۆ خواو سوپاس‌و ستایش هەر بۆ ئەو، بە ئەندازەی ژمارەی دروستکراوەکانی‌و رازیبوونی خۆی‌و سەنگی عەرشەکەی زۆرو گەورەیی وشەکانی).(سێ جار).

١٨- (ما أصبحتُ غداة قط إلا استغفرت الله فيها مائة مرة))[٢] واتە : هیچ رۆژێك رۆژم بە سەردا نایەتەوە ئیللا سەد جار تێیدا داوای لێخۆش بوون لە خوا دەکەم).

١ /( الصحيحة : ٢١٥٦)

٢ /( الصحيحة : ١٦٠٠)

ئەو زیکرانەیَ کە تایبەتن بە ئێواران

١٩- (أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلـق) (ثلاث مرات)[١] واتە :پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوا لە خراپەی دروستکراوەکانی) (سێ جار).

## ٢- ما يقال عند النوم

## ئەو زیکرانەی پێش نوستن دەگوترێت

٢٠- (باسمِكَ اللهم أمـوت وأحيـا)[٢] واتـە : (ئـەی خودایە.. بە ناوی تۆوە دەمرمو دەژیم).

١ /( مختصر مسلم: ١٤٥٢)، (صحيح الترمذي : ٣٦٠٤/م)

٢ /(الصحيحة : ٢٧٥٤ )، ( مختصر البخاري : ٢٤٢٥)

٢١– (باسمك ربي وضعتُ جنبي، وبك أرفعهُ، فإن أمسكت نفسي فارحمها، وإن أرسلتها فاحفظها بما تحفظ به عبادك الصالحين)[1] واتە : بە ناوی تۆوە ئەی پەروەردگارا... تەنیشتم دادەنێمو هەر بەناوی تۆوە بەرزی دەکەمەوە، ئەگەر نەفسەکەمت گرتەوە ئەوا بەزەییت پێیدا بێتەوەو ئەگەر ناردتەوە ئەوا بیپارێزە بەوەی کە بەندە چاکەکارەکانی خۆت دەپارێزێت.

٢٢– اللهم عالم الغيب والشهادة ، فاطر السموات والأرض، رب كل شيء ومليكه، أشهد أن لا إله إلا أنت، أعوذ بك من شر نفسي، و شر الشيطان وشركه، وأن أقترف على نفسي سوءًا، أو أجُره إلى

١ /( صحيح الترمذي : ٣٤٠١)

مسلم))[١] واتە : ئەی خودایە.. ئەی ئەو کەسەی کە زاناو ئاگاداری پەنهانو ئاشکرای، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوی، پەروەردگارو پادشای هەموو شتەکان، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها تۆ نەبێت، پەنات پێ دەگرم لە خراپەی نەفسی خۆم، وە پەنات پێ دەگرم لە خراپەی شەیتانو داوو تەڵەکەی، وە لەوەی کە خراپەیەك بهێنم بە سەر نەفسی خۆمداو یان بیئاڵێنم بە موسڵمانێکدا).

٢٣- ((اللهم قني عذابك، يوم تبعثُ عبادك)[٢] واتە: ئەی خودایە.. لە سزاکەت بمپارێزە لەو ڕۆژەی کە بەندەکانتی تێدا زیندوو دەکەیتەوە.

---

١ /(الصحيحة : ٢٧٦٣)

٢ /( الصحيحة : ٢٧٥٤)، (تراجع العلامة : ١٣٩)

٢٤- (الحمد لله الذي أطعمنا وسقانا، وكفانا وآوانا، فكم ممن لا كافي له ولا مؤوي)[١] واته: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە تێری کردین‌وتێر ئاوی کردین‌وپێویستی نەخستینە دەستی جگە لە خۆی (تەنها ئەو بەسمانە)و داڵدەی داین، چەندەها کەس هەن کە خوا بە بەس نازانن‌و داڵدەیان نییە.

٢٥- (اللهم أنت خلقت نفسي، و أنت توفّاها، لك مماتها و محياها، إن أحييتها فاحفظها، و إن أمتها فاغفر لها ، اللهم إني أسألك العافية))[٢] واته : ئەی خودایە.. تۆ نەفسەکەی منت دروست کردووەو هەر تۆ دەیمرێنیت، مردن وژیانی تەنها بۆ تۆیە، ئەگەر

---

١ /(مختصر مسلم : ١٩٠١)

٢ /(مختصر مسلم : ١٨٩٨)

ژیانتەوە (زیندووت کردەوە) ئەوا بیپارێزەو ئەگەر مراندت ئەوا لێی خۆشبە، ئەی خودایە.. من داوای لەشساغیت لێ دەکەم.

٢٦- اللـــهم رب الـــسماوات، ورب الأرض، ورب العرش العظيم، ربنا ورب كل شيء، فالق الحب والنوى ، ومنزل التوراة والإنجيل والفرقان ، أعوذ بك من شرِّ كلِّ ذي شر أنت آخذٌ بناصيته، اللهم أنت الأول فليس قبلك شيءٌ، وأنت الآخر فليس بعدك شيءٌ، وأنت الظاهر فليس فوقك شيءٌ، وأنت الباطن فليس دونك شيءٌ، اقض عنا الدين وأغننا من الفقر))[1] واتە : ئەی خودایە.. هەر تۆ پەروەردگاری ئاسمانەکانو پەروەردگاری زەویتو پەروەردگاری

---

١ /(مختصر مسلم : ١٨٩٩)؛( صحيح الترمذي : ٣٤٠٠)

عەرشی مەزنی، پەروەردگاری ئێمەو پەروەردگاری هەموو شتێکیت، هەر تۆ تەقێنەری هەموو دانەوێڵەو تۆوێکیت، دابەزێنەری تەوراتو ئینجیلو قورئانی، پەنات پێدەگرم لە خراپەی هەموو خراپەکارێك کە ناوچەوانی بە دەستی تۆیە، ئەی خودایە.. تۆ یەکەم کەسێکیتو هیچ کەسێك لە پێش تۆ نەبووەو تۆ دوایین کەسێکیتو هیچ کەسێك لە پاش تۆ نییە، تۆ خاوەن دەسەڵاتو شکۆمەندیو هیچ کەسێك لە سەرووی تۆوە نییە، هەر تۆ پەنهانیو جگە لە تۆ کەس لە وردەکارییەکان ئاگادار نییە، قەرزەکانمان لە سەر هەڵگرەو دەوڵەمەندمان بکە لە هەژاری.

٢٧- إذا أتيت مضجعك فتوضأ وضوءك للصلاة ثم اضطجع على شقك الأيمن ، وقل: اللهم أسلمت نفسي إليك ، ووجهت وجهي إليك، وفوضت أمري إليك ، وألجأت ظهري إليك، رغبة ورهبة إليك، لا ملجأ ولا منجا منك إلا إليك ، آمنت بكتابك الذي أنزلت وبنبيك الذي أرسلت))[1] واتە : ئەگەر چوویتە سەر جێگەی نوستنت ئەوا دەستنوێژ بشۆرە هەروەکو چۆن دەستنوێژ بۆ نوێژ دەشۆریتو ئەمجار لە سەر لای ڕاستت ڕاکشێو بڵێ : ((ئەی خودایە.. ئەوا من نەفسی خۆمت تەسلیم دەکەم، رووم کردە تۆو هەموو کارێکم دا بە دەستی تۆو پشتم بە تۆ بەست، بە خواستی خۆمو لە ترسی

---

١ /( متفق عليه، والسياق للبخاري مركباً من روايتين له ) ( مختصر البخاري : ٢٤٢٦)

تـۆدا، هـیچ رزگاربوونێـكو حەشـارگەو پەناگەیـەك نییە لە تۆ مەگەر تەنها بـۆ لای تـۆ نـەبێت، بـاوەڕم هێنـــا بـــە كتێبەكـــەت كـــە دادبەزانـــدووەو بـــە پێغەمبەرەكەت (ﷺ) كە رەوانەت كردووە.)

٢٨- لا إله إلا الله وحده لا شريك لـه ، لـه الملـك وله الحمد وهو على كل شئ قدير ، لا حـول ولا قـوة إلا بـالله، سـبحان الله والحمـد لله ولا إلـه إلا الله، والله أكـبر)[١] واتــە : هـیچ پەرسـتراوێك نییـە شایـستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت، تەنهاو بێ هاوەڵە، موڵكو سوپاسو ستایش تەنها بۆ ئەوەو توانای بە سەر هەموو شتێكدا هەیە، هیچ توانـاو هێزێـك نییـە

---

١ /(الصحيحة : ٣٤١٤)

مەگەر بە خوای بەرز ومەزنەوە نەبێت، پاکیو بێگەردی بۆ خواو سوپاسو ستایش بۆ خواو هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێتو خوا لە هەموو گەورەترە.

٢٩- (الحمد لله الذي كفاني و آواني، والحمد لله الذي أطعمني وسقاني، الحمد لله الذي منَّ عليَّ وأفضل، اللهم إني أسألك بعزتك أن تنجيني من النار)[١] واتە : سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی کە پێویستی نەخستینە دەستی جگە لە خۆی (تەنها ئەو بەسمانە)و داڵدەی داین، وە سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە تێری کردینو تێر ئاوی کردینو

١ /(الصحيحة : ٣٤٤٤)

سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە فەزڵو منەتی خۆی ڕژاندووە بە سەرمدا، ئەی خودایە داوات لێ دەکەم بە عیززەتی خۆت لە سزای ئاگر ڕزگارم بکەی)

٣٠- الحمد لله الذي كفاني و آواني، و أطعمني وسقاني، الحمد لله الذي منَّ عليَّ فأفضل، والحمد لله الذي أعطاني فأجزل، والحمد لله على كل حال، اللهم ربَّ كل شئ ومالكَ كل شئ و إله كل شئ لك كل شئ أعوذ بك من النار)[١] واتە : سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی کە پێویستی نەخستینە دەستی جگە لە خۆی (تەنها خۆی بەسمانە)و دالدەی داین، وە تێری کردینو تێر ئاوی کردینو سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە فەزڵو منەتی خۆی ڕژاندووە بە

---

١ /(صحيح الموارد : ٢٣٥٧)

سه‌رمدا، وه سوپاس بۆ ئه‌و خوایه‌ی كه زۆری پێ به‌خشیوین، سوپاس بۆ خوا له هه‌موو حاڵێكدا، ئه‌ی خودایه.. په‌روه‌ردگارو خاوه‌ن‌و په‌رستراوی هه‌موو شتێك، هه‌موو شتێك هی تۆیه، په‌نات پێ ده‌گرم له ئاگر)

٣١- (بسم الله وضعت جنبي، اللهم اغفر لي ذنبي، وأخسأ شيطاني، وفك رهاني، وثقل ميزاني، واجعلني في النديِّ الأعلى)[1] واته : به ناوی خوداوه ته‌نیشتم له سه‌ر جێ دانا، ئه‌ی خودایه.. له تاوانه‌كانم خۆشبه..و شه‌یتانه‌كه‌م سووك‌و ریسواو دوور بكه‌ره‌وه‌و ده‌ربازم بكه له هه‌موو حه‌قێك به سه‌رمه‌وه‌یه‌و ته‌رازووه‌كه‌م – له قیامه‌تدا – قورس

١ /(هداية الرواة : ٢٣٤ و إسناده صحيح )، ( صحيح الجامع : ٤٦٤٩)

بکە، وە بمگێڕە لە مەجلیسی بەرزو بەڕێزانی لای فریشتەکانی ئاسمان.

٣٢-قال رسول الله (ﷺ) لعلي وفاطمة رضي الله عنهما: ألا أدلكما على ما هو خير لكما من خادم؟ إذا أويتما إلى فراشكما فسبحا ثلاثا وثلاثين ، واحمدا ثلاثا وثلاثين ، وكبرا اربعاً وثلاثين)[1] واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە (علی)و (فاطمة)ی فەرموو : ئایە شتێکتان پێ بڵێم باشتر بێت بۆتان لە خزمەتکار؟ ئەگەر چوونە سەر جێگاکەتان ئەوا سیو سێ جار بڵێن (سبحان الله)و سیو سێ جار بڵێن (الحمد لله)و سیو سێ جار بڵێن (الله أكبر).

---

١ /(الصحيحة : ٣٥٩٦)،(مختصر البخاري : ٢٤٢٧)، ( مختصر مسلم : ١٨٩).

٣٢– إذا أوى إلى فراشه كل ليلة جمع كفيه ثم نفث فيهما فقرأ فيهما : ﴿قل هو الله أحد﴾ و﴿ قل أعوذ برب الفلق﴾و ﴿قل أعوذ برب الناس﴾ ثم يمسح بهما ما استطاع من جسده" يبدأ بهما على رأسه ووجهه وما أقبل من جسده، يفعلُ ذلك ثلاث مرات)[١] واته : ئەگەر هەموو شەوێك بچوایەتە سەر جێگەكەی ئەوا هەردوو دەستی كۆ دەكردەوەو ئەمجار فووی پیادەكردنو ئەم سورەتانەی دەخوێندەوە: ﴿قل هو الله أحد﴾ و﴿ قل أعوذ برب الفلق﴾ و ﴿قل أعوذ برب الناس﴾ ئەمجار ئەوەی لە توانایدا بوایە جەستەی خۆی پێ دەسڕین، سەرەتا لە سەرو دەموچاوو پێشەوەی

---

١ /(الصحيحة: ٣١٠)،( مختصر البخاري : ٢٠٢٥)

جەستەی دەستی پێدەکرد، ئەم کارەی سێ جار ئەنجام دەدا)

٣٤- فأقرأ آية الكرسي : ﴿الله لا إله إلا هو الحي القيوم.....))[1] واتە : (آیة الکرسي) بخوێنە : ﴿الله لا إله إلا هو الحي القيوم....﴾

٣٥- (من قرأ الآيتين من آخر سورة البقرة في ليلة كفتاه ﴿ لله ما في السموات وما في الرض وإن تبدوا ما في أنفسكم أو تخفوه يحاسبكم به الله ﴾ إلى آخر السورة.)[2] واتە : هەرکەسێك شەوانە دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی (البقرة) بخوێنێ ئەوا بەسیەتی ﴿لله ما في السموات وما في الرض وإن تبدوا ما في

١ /(صحيح الكلم : ٢٦)

٢ /(صحيح الكلم : ٢٧)

أنفسكم أو تخفوه يحاسبكم بـه الله ﴾ تـا كۆتـایی سورەتەكە.

٣٦–اقرأ ﴿ قل يا ايها الكافرون﴾ فإنها براءة من الشرك)[١] واتـە : ﴿ قـل يـا ايهـا الكـافرون﴾ بخوێنـە چونكە ئەوە دەبێتە مایەی پاكانـەو سـەرفەرازبوون (بەرائەت) لە هاوەڵ بڕیاردان.

٣٧– كان رسول الله (ﷺ) لا ينام حتى يقـرأ(ألم. تنزيل) السجدة و(تبارك الـذي بيـده الملـك)[٢] واتـە : پێغەمبەری خـوا (ﷺ) نەدەخـەوت تـاوەكو هـەردوو سورەتی (السجدة) و (الملك)ی نەخوێندایە.

---

١ /(صحيح الترمذي : ٣٤٠٣)

٢ /(الصحيحة : ٥٨٥)

٣٨- كــان رســـول الله (ﷺ) لا ينـــام حتـــى يقرأ(الزمر) و(بني إسرائيل)[١] واته : پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەدەخەوت تاوەكو هەردوو سورەتی (الزمر) و (بـنی إسـرائیل)ی نەخوێندایـە.(واتـە : سـورەتی الاسراء) .

٣٩- كان لا ينام حتى يقرأ المسبحات ويقول : فيها آية خير من ألف آية.)[٢] واته : پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەدەخـــەوت تـــاوەكو ســـورەتەكانی (المسبحات)ی نەخوێندایەو دەیفەرموو : ئایـەتێكی تێدایە خەیری لە هەزار ئایەت زیاترە.

١ /(الصحيحة : ٦٤١)

٢ /( صحيح الترمذي : ٣٤٠٦).

(المسبحات) بریتین لەو سورەتانەی کە بە ﴿سبح﴾ یان ﴿یسبح﴾ دەست پێدەکات، ئەوانیش بریتین لە سورەتی: الحدید والحشر والصف والجمعة والتغابن والأعلی.

## ٣- ما یقوله إذا وضع ثوبه لنوم ونحوه
## چی دەڵێت کاتێ جلوبەرگەکەی داکەند بۆ خەوتن

٤٠-سِتْرُ مَا بَيْنَ أعْينِ الجِنِّ وَعَوْرَاتِ بَنِي آدم إذا وَضَعَ أَحَدُهُمْ ثَوْبَهُ أنْ يقول: بِسم الله)[١] واتە : پەردەی نێوان چاوەکانی جنۆکەکانو عەورەتی ئادەمیزاد ئەگەر یەکێکیان جلوبەرگەکەی داکەند بڵێت : بسم الله (بە ناوی خوا).

---

١ /(صحیح الجامع : ٣٦١٠)

## ٤-الدعاء إذا فزع من النوم
## (چی دەڵێت کاتێ لە خەو دا پەڕی)

٤١- أعوذ بكلمات الله التامة من غضبه وعقابه ومن شر عباده ومن همزات الشياطين وأن يحضرون)[1] واتە: پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوا لە پەستیو توورەییو تۆڵەی ئەوو لە خراپەی بەندەکانیو لە شێتی شەیتانەکانو لەو کاتانەی کە ئامادە دەبن)

٤٢- اعوذ بكلمات الله التامة من غضبه وشر عباده ومن همزات الشياطين وان يحضرون) واتە:

١ / الصحيحة : ٢٦٤ )

پەنا دەگرم بە وشە تەواوەكانی خوا لە پەستیو تووڕەییو لە خراپەی بەندەكانیو لە شێتی شەیتانەكانو لەو كاتانەی كە ئامادە دەبن)[١].

٤٣- أعوذ بكلمات الله التامَّات التي لا يجاوزهنّ بَر ولا فاجرُ، من شرِّ ما ينـزل من السماء و ما يعرج فيها، ومن شرِّ فتن الليل والنهار، ومن كلِ طارق إلا طارق يطرق بخير، يا رحمن)[٢] واتە: پەنا دەگرم بە وشە تەواوەكانی خوا كە هیچ چاكەكارێكو خراپەكارێك لێی تێناپەڕێت، لە خراپەی ئەوەی لە ئاسمانەوە دادەبەزێتو ئەوەی تێیدا بەرز دەبێتەوە وە لە خراپەی فیتنەكانی شەوانو

---

١ /(صحيح الكلم : ٣٨)

٢ /(الصحيحة :٢٧٢٨)

ڕۆژگار، وە لە خراپـەی هـەموو کوتـەرێك (بـە شـەو هـاتوو) جگـە لـە کوتـەرێکی خـەیرو چـاکە، ئـەی بەخشندە..).

## ٥- الدعاء إذا تقلب بالليل
## پارانەوەی شەوانە کاتێك لە سەر جێگەکەی وەردەگەڕێت

٤٤- (لا إلـه إلا الله الواحـد القهـار رب الـسموات والأرض ومـا بينهمـا العزيـز الغفـار)[١] واتـه : هـیچ پەرسـتراوێك نییـە شایـستەی پەرسـتن بێـت تـەنها (الله) نەبێت تەنهاو سزادەرو زەبونکـەری بـێ بـڕواو هاوبـەش پەیداکەرانـە بـە توانـای خـۆی –القهـار–،

١ /(صحيح الموارد : ٢٣٥٨)،( الصحيح : ٢٠٦٦).

پــەروەردگاری ئاسمانــەکانو زەویو ئــەوەی لــە نێواندایە، هەر خۆی بە دەسەڵاتو لێبوردەیە).

## ٦- ما يقول من استيقظ بالليل
## (چی دەڵێت ئەگەر بە شەو هەستا)

٤٥- مَنْ تَعَارَ منَ اللّيْل فقال: لا إلَهَ إلاّ الله وحْـدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ ولَهُ الحَمْدُ وهُوَ على كلِّ شـيءٍ قَدير، الحَمْدُ لله وسُبْحانَ الله ولا إلـه إلا الله والله أكـبر ولا حَولَ ولا قُوةَ إلا بالله العلي العظيم) ثم قال: اللّهُمَّ اغْفِرْ لـي، أو دعـا استُجيبَ لـهُ، فـإن تـوَضـأ وصَـلّى قُبِلَتْ صَلاتُهُ)[١] واتــە : هــەر کەسـێك شـەو لـە خـەو هەستاو وتـی : (هـیچ پەرسـتراوێك نییـە شایـستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت، تەنهاو بێ هاوەڵە،

---

١ /(مختصر البخاري : ٥٧٦)،( صحيح الكلم : ٣٥)

موڵكو سوپاسو ستایش تەنها بۆ ئەوەو توانای بە سەر هەموو شتێكدا هەیە، سوپاسو ستایش بۆ خواو پاكی بێگەردی بۆ خواو هیچ خودایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (اللّه) نەبێت، خوا لە هەموو شتێك گەورەترە، هیچ هێزو توانایەك نییە تەنها بە خوای گەورەی باڵادەستی مەزن نەبێت) ئەمجار وتی : ئەی خودایە لێم خۆشبە، یان داوایەكی كرد ئەوا وەڵامی دەدرێتەوە، جا ئەگەر دەستنوێژی شوشتو نوێژی كرد ئەوا نوێژەكەی وەردەگیرێت)

٤٦- من أوى إلى فراشه طاهراً، لم ينقلب ساعة من الليل يسأل الله شيئاً من خير الدنيا والآخرة إلا أعطاه الله إياه)[1] واتە : هەركەسێك بە

١ /(صحيح الكلم الطيب: ٣٦)

دەستنوێژەوە چووە سەر جێگەی نوستنی، لە شەودا هەركاتێك لە بارێكەوە وەرگەڕێتە بارێكی تر هەر داوایەك لە خوای گەورە بكات لە خەیرو چاكەی دونیاو دوارۆژ ئیللا خوای گەورە پێی دەبەخشێت.

٤٧–ينظر الى السماء ثم يقرأ العشر آيات خواتم سورة (آل عمران) ﴿إن في خلق السموات والأرض واختلاف الليل والنهار لآيات لأولي الألباب...﴾ (الآية ١٩٠ إلى آخر السورة)[1] واتە : تەماشای ئاسمانی دەكردو ئەمجار دە ئایەتی كۆتایی سورەتی (ال عمران)ی دەخوێندەوە : ﴿إن في خلق

---

١ /(مختصر البخاري : ٩٢ )

السموات والأرض واختلاف الليل والنهار لآيات لأولي الألباب...﴾ (ئایەتی ١٩٠ تا كۆتایی سورەتەكە)

٤٨- اللهم لك الحمد أنت قيّم السموات والأرض ومن فيهن ، ولك الحمد لك ملك السموات والأرض ومن فيهن ولك الحمد أنت نور السموات والأرض ومن فيهن ولك الحمد أنت ملك السموات والأرض ولك الحمد أنت الحق ، ووعدك الحق ، ولقاؤك حق ، وقولك حق والجنة حق والنار حق والنبيون حق ومحمد (ﷺ) حق والساعة حق، اللهم لك أسلمت وبك آمنت، وعليك توكلت، وإليك أنبت ، وبك خاصمت، وإليك حاكمت ، فاغفر لي ما قدمت و ما أخرت وما أسررت وأعلنت ،وما أنت أعلم به مني أنت المقدم وأنت المؤخر أنت إلهي لا إله إلا أنت ولا حول ولا

قـوة إلا بـالله)[١] واتـه : (ئـه‌ی خودایـه.. سـوپاس‌و ستایش بـۆ تۆیـه، هـه‌ر تـۆ ڕاگـری ئاسمانـه‌کان‌و زه‌ویـت‌و هـه‌موو ئـه‌و شـتانه‌ی لـه ناویاندایـه، سـوپاس‌و سـتایش بـۆ تـۆ، مـوڵكی ئاسمانـه‌کان‌و زه‌وی‌و هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی له ناویاندایه هـی تۆیـه، سـوپاس‌و سـتایش بـۆ تـۆ، تـۆ نـورو ڕونـاکی ئاسمانـه‌کان‌و زه‌ویـت‌و هـه‌موو ئـه‌و شـتانه‌ی لـه ناویاندایـه، سـوپاس‌و سـتایش بـۆ تـۆ، هـه‌ر تـۆ پادشای ئاسمانه‌کان‌و زه‌ویت، سوپاس بۆ تـۆ هـه‌ر تـۆ ڕاسـت‌و ڕه‌وای، به‌ڵێنـه‌کانت ڕاسـت‌و ڕه‌وان، گه‌یشتن بـه تـۆ ڕاسـت‌و ڕه‌وایـه, وتـه‌کانت ڕاسـت‌و ڕه‌وان، جه‌ننـه‌ت ڕاسـت‌و ڕه‌وایـه‌و ئـاگر ڕاسـت‌و

---

١ /(مختصر البخاري : ٥٥٦)

ڕەوایەو پێغەمبەران ڕاستو ڕەوانو (محمد) یش (ﷺ) ڕاستو ڕەوایەو دوارۆژ ڕاستو ڕەوایە، ئەی خودایە خۆم تەسلیمی تۆ کردو ئیمانم بە تۆ هێناو پەنام گرت بە تۆو گەڕامەوە بۆ لای تۆو بە پشتی تۆ داکۆکی دەکەم لە مافەکانمو داوەری دەگێڕمەوە بۆ لای تۆ، بۆیە لە تاوانەکانم خۆشبە ئەوەی کە پێشم خستوەو ئەوەی پاشم خستوەو ئەوەی کە شاردومەتەوەو ئەوەی ئاشکرام کردوە، ئەوەی تۆ باشتر لە من پێی دەزانیت، هەر تۆ پێشخەرو دواخەری، تۆ خودای منی، هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها تۆ نەبێت، هیچ هێزو توانایەك نییە تەنها بە خوای گەورە نەبێت.

## ٧- الدعاء والاستغفار في الثلث الآخر من الليل

## پارانەوەو داوای لێخۆشبوون لە کۆتایی سێیەکی شەواندا

٤٩- ینزل ربنا تبارك وتعالى كل ليلة إلى سماء الدنيا، حين يبقى ثلث الليل الآخر فيقول : من يدعوني فأستجيب له ؟ من يسألني فأعطيه ؟ من يستغفرني فأغفر له ؟)[1] واتە : هەموو شەوێك پەروەردگارمان -بەرزو پیرۆزبێت- دادەبزێتە ئاسمانی دونیا (دابەزینێك شایستەی خوای گەورە بێت) کاتێك سێیەکی کۆتایی شەو دەمێنێت، دەڵێت : کێ لێم دەپاڕێتەوە وەڵامی دەدەمەوە ؟ کێ داوام لێ دەکات پێی ببەخشم ؟ کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات لێی خۆش بم ؟)

---

١ /(مختصر البخاري : ٧٥٠ )

٥٠– أقرب ما يكون الرب من العبد في جوف الليل الآخر، فإن استطعت أن تكون ممن يذكر الله في تلك الساعة، فكن)[١] واته : نزيكترين كات كه پەروەردگار له بەندەكەيەوە نزيك بێت لە كۆتايى شەوەدايە، ئەگەر توانيت لەو ساتانەدا لەو كەسانە بيت كە يادى خوا دەكەن، ئەوا ببە).

## ٨- دعاء القنوت الوتر
## پاڕانەوەى قنوتى نوێژى وتر

٥١– اللهم اهدني فيمن هديت، وعافني فيمن عافيت وتولني فيمن توليت وبارك لي فيما أعطيت وقني شر ما قضيت فإنك تقضي ولا يقضى عليك

١ /(صحيح الترمذي : ٣٥٧٩)

وإنه لا يذل من واليت ولا يعز من عاديت تباركت ربنا وتعاليت لا منجا منك إلا إليك وصلى الله على النبي الأمي(ﷺ))[١] واته : ئەی خودایه..ڕێنموویم بکه له گەڵ ئەوانەدا کە ڕێنموویت کردوون، وە پارێزراوو لەشساغم بکە لە گەڵ پارێزراوو لەشساغاندا، وە پشتگیریم بکە لە گەڵ پشتگیری لێکراواندا، وەبەرکەت بخەرە ناو ئەوەی پێم دەبەخشی، وە بمپارێزە لە خراپەی ئەوەی بڕیارت لە سەر داوە، بە ڕاستی تەنها تۆ بڕیار دەدەیتو هیچ کەسێك بڕیار نادات بە سەرتدا، ئەوەی تۆ پشتگیری بکەیت هەرگیز زەبوون نابێتو ئەوەی تۆ دوژمنایەتی بکەیت هەرگیز بە عیززەت نابێت، پاکیو

١ /( صفة الصلاة : ١٨٠)، ( صحيح أبي داود : ١٢٨١)

بێگەردی‌و بەرزی بۆ تۆیە ئەی پەروەردگارمان، هیچ رزگاربوونێك نییە لە تۆ تەنها بۆ لای تۆ نەبێت، ئەی خودایە صەڵاوات بڕژێنە سەر پێغەمبەری نەخوێندەواردا (ﷺ))

٥٢- عن عبدالرحمن بن عبدالقاري قال : وكانوا يلعنون الكفرة في النصف : اللهم قاتل الكفرة الذين يصدون عن سبيلك و يكذبون رسلك ولا يؤمنون بوعدك وخالف بين كلمتهم وألق في قلوبهم الرعب وألق عليهم رجزك وعذابك، إله الحق) ثم يصلي على النبي(ﷺ) ويدعو للمسلمين بما استطاع من خير، ثم يستغفر للمؤمنين.

قال : وكان يقول إذا فرغ من لعنه الكفرة وصلاته على النبي (ﷺ) واستغفاره للمؤمنين والمؤمنات

ومسألته : (اللهم إياك نعبد ولك نصلي ونسجد وإليك نسعى ونحفد ونرجو رحمتك ربنا ونخاف عذابك الجد، إن عذابك لمن عاديت ملحق) ثم يكبر ويهوي ساجداً.)[1] واتە : لە (عبدالرحمن ی کوڕی عبدالقاری)یەوە دەڵێت : لە نیوەی –ڕەمەزان بە دواوە لە نوێژی وەترەکاندا– لەعنەتیان دەکرد لە بێباوەڕان دەیانگوت : ئەی خودایە.. ئەو بێباوەڕانەی کە ڕووبەڕووی ڕێگەکەی تۆ دەبنەوەو پێغەمبەرکەت(ﷺ) بە درۆ دەخەنەوەو باوەڕیان بە بەڵێنەکانت نییە لەعنەتیان لێ بکەو وتەو قسەیان جیاوازو ناکۆك بکەو ترسو بیم بخەرە دڵیانەوەو سزاو غەزەبی خۆت ببارێنە سەریاندا، ئەی خودای

[1] /(قيام رمضان : ٣٢)

حـەق‌و راسـتی) ئـەمجار صـلاوات دەدا بـە سـەر پێغەمبـەری خـودا (ﷺ)و دوعـای چـاکەی بـۆ موسـلمانان دەکـردو ئـەوەی لـە توانایـدا بوایـەو ئەمجار داوای لێخۆشبوونی بۆ موسلمانان دەکرد)

دەڵێـت: ئەگـەر لـە لەعنـەت کردنـی بێبـاوەڕان‌و صـلاوات لـە سـەر پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)و داوای لێخۆشـبوون بـۆ ئیمانـداران‌و داواکـانی خـۆی ببوایەتـەوە دەیفـەرموو : ئـەی خودایـە..تـەنها تـۆ دەپـەرستین‌و بۆ تۆ نوێژ دەکەین‌و کڕنۆش دەبـەین، هەوڵ‌و کۆششمان بـۆ لای تۆیـەو خێرایـی دەکـەین، تکاو ئومێدی رەحمەتی تـۆین ئـەی پـەروەردگارا.. لـە سزا سـەختەکەت دەترسین، سزاکەت دەگاتـە دوژمنان‌و نەیارانت)) ئـەمجار (الله أکبر)ی دەکـردو سوژدەی دەبرد.

## ٩- الذكر بعد الوتر

## زیکری پاش ویتر

٥٣-كان النبي (ﷺ) يقرأ في الركعة الأولى من الوتر بـ ﴿ سبح اسم ربك الأعلى﴾ وفي الثانية بـ ﴿قل يا أيها الكافرون ﴾ وفي الثالثة بـ ﴿قل هو الله أحد﴾ و ﴿قل أعوذ برب الفلق﴾ و ﴿قل أعوذ برب الناس﴾[١] واته : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ركاتی یەكەمدا لە نوێژی وەتردا﴿ سبح اسم ربك الأعلى﴾ی دەخوێندو لە ركاتی دووەمدا ﴿ قل يا أيها الكافرون ﴾و لە سێیەمدا ﴿قل هو الله أحد﴾ و ﴿قل أعوذ برب الفلق﴾ و ﴿قل أعوذ برب الناس﴾.

---

١ /(صحيح أبي داود : ١٢٨)

قال الشيخ –رحمه الله– : ومن السنة أن يقول في آخر وتره قبل السلام أو بعده :

شێخ –ڕەحمەتی خوای لێبێت– فەرمووی : سوننەتە لە کۆتایی وەترەکەیداو پێش ئەوەی سەلام بداتەوە یان لە پاشی بڵێت :

٥٤– -اللهم إني أعوذ برضاك من سخطك ، وبمعافاتك من عقوبتك ، وأعوذ بك منك ، لا أحصي ثناء عليك أنت كما أثنيت على نفسك.)[1] واتە : ئەی خودایە پەنا بە ڕازیبوونت دەگرم لە تووڕەبوونت، وە بە لێبوردنت لە تۆڵەکەت، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە تۆ، ناتوانم سوپاس وستایشی تۆ بژمێرم هەروەکو چۆن تۆ وەسفی ستایشی خۆتت کردووە).

---

١ /( صحيح أبي داود : ١٢٨٢)

٥٥– يقول بعد الوتر : (سبحان الملك القدوس) ثلاث مرات ويمد بها صوته ويرفع في الثالثة.)[١] واتە : لە پاش ویتر دەیفەرموو : ((پاکیو بێگەردی بۆ پادشای پاکو پیرۆز)) (سێ جار)و دەنگی درێژ دەکردەوەو لە جاری سێیەمدا دەنگی بەرز دەکردەوە.

## ١٠–ما يصنع من رأى رؤيا يكرهها
## چی دەکات ئەگەر کەسێك خەونێکی ناخۆشی بینی؟

٥٦–(الرؤيا من الله والحلم من الشيطان فإذا رأى أحدكم شيئاً يكرهه فلينفث عن يساره ثلاث مرات إذا استيقظ، وليتعوذ بالله من شرها فإنها لن تضره

١ /.(صحيح النسائي : ١٧٥٢)، ( قيام رمضان : ٣٢) (صحيح أبي داود : ١٢٨٤).

إن شاء الله) واتە : خەونی خۆش‌و باش لە لایەن خوداوەیەو خەونی ناخۆش لە شەیتانەوەیە ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەونێکی ناخۆشی بینی ئەوا ئەگەر هەستا لە خەو با سێ جار تف بکات بە لای چەپیداو پەنا بگرێت بە خوا لە خراپەی، ئەوا چیتر زیانی پێ ناگەیەنێت – إن شاء الله –.

٥٧– وفي رواية : (الرؤيا الصالحة من الله فإذا رأى أحدكم ما يحب فلا يحدث به إلا من يحب، وإن رأى ما يكره فلا يحدث به، وليتفل عن يساره ثلاثاً وليتعوذ بالله من الشيطان الرجيم من شر ما رأى، فإنها لن تضره)[١] واتە : خەونی خۆش‌و باش لە لایەن خواداوەیە ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەونێکی

١ /(مختصر البخاري : ٢٦٣٤)، ( مختصر مسلم : ١٥١٦، ١٥١٧)

خۆشی بینی ئەوا با تەنها لای ئەو کەسە باسی بکات کە خۆشی دەوێت، وە ئەگەر خەونێکی ناخۆشی بینی ئەوا با لای هیچ کەسێك نەیگێڕێتەوەو سێ جار تف بکات بە لای چەپیداو پەنا بگرێت بە خوا لە شەیتانی نەفرین لێکراو لە خراپەی ئەوەی کە بینیویەتی، ئەوا چیتر زیانی پێ ناگەیەنێت.

٥٨- إذا رأى أحدكم الرؤيا يكرهها، فليبصق عن يساره ثلاثاً، وليستعذ بالله من الشيطان ثلاثاً، وليتحول عن جنبه الذي كان عليه)[١] واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەونێکی ناخۆشی بینی ئەوا با سێ جار تف بکات بە لای چەپیداو سێ جار پەنا بگرێت

---

١ /(مختصر مسلم : ١٥١٨)، (صحيح الكلم الطيب : ٤٠)

بە خوا لە شەیتان‌و لە سەر ئەو لایە وەرگەڕێ کە لە سەری بووە.

٥٩- فإذا رأى أحدكم رؤيا تعجبه فليقصها إن شاء وإذا رأى شيئاً يكرهه فلا يقصه على أحد وليقم يصلي)[١] واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەونێکی خۆشی بینی با بیگێڕێتەوە ئەگەر ویستی لێ بوو، وە ئەگەر خەونێکی ناخۆشی بینی ئەوا با لای هیچ کەسێك باسی نەکات‌و با هەستێ نوێژ بکات.

٦٠- إذا رأى أحدكم الرؤيا تعجبه فليذكرها وليفسرهاوإذا رأى أحدكم الرؤيا تسوؤه فلا يذكرها ولا يفسرها)[٢] واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەونێکی

---

١ /(الصحيحة : ١٣٤١)

٢ /(الصحيحة : ١٣٤٠)

خۆشی بینی با باسی بکاتو خەوپەرژێنی بکات، وە ئەگەر خەونێکی ناخۆشی بینی ئەوا با لای هیچ کەسێك باسی نەکاتو خەوپەرژێنی نەکات.

کورتەی باسەکە :

١- سێ جار تف دەکات بە لای چەپیدا.

٢- سێ جار پەنا دەگرێت بە خوا لە شەیتانو لە خراپەی ئەوەی بینیویەتی.

٣- لە سەر ئەو لایە وەردەگەرێ کە لە سەری بووە.

٤- هەڵدەستێ نوێژ دەکات.

٥- خەو پەرژێنی ناکات.

٦- لای هیچ کەسێك باسی ناکات.

# ١١-أذكار الاستيقاظ من النوم

## زیکرەکانی هەستان لە خەو

٦١- الحَمْدُ لله الّذى أحْيانا بَعدَ ما أماتَنا وَ إلَيهِ النُشُورُ[١] واتە : سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوای کە زیندووی کردینەوە لە پاش ئەوەی مراندنی(واتە : خەوتن)و زیندووبونەوەش هەر بۆ لای ئەوە.

٦٢- (الحَمْدُ لله الذِي رَدَّ عَلَيَّ رُوحِي وعَافَانِي في جَسَدِي وأذِنَ لي بِذِكْرِهِ.)[٢] واتە : سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی کە رۆحی بۆ گەڕاندمەوەو لەشساغی کردمو ئیزنی دام یادو زیکری بکەم).

١ /(الصحيحة : ٢٧٥٤)، ( مختصر البخاري : ٢٤٢٥)

٢ /(صحيح الكلم : ٣٧)

## ١٢- دخول الخلاء

## چوونه سەرئاو

٦٣- سِتْرُ ما بَيْنَ الجِنِّ وَعَوْرَاتِ بَني آدَمَ إذا دخل الخلاء أن يقول: بِسم الله)[١] واتـه : پـەردەی نێـوان جنۆكەو عەورەتی ئادەمیزاد ئەگـەر چـووە سـەرئاو ئەوەیە بلێت : بسم الله (بە ناوی خوا)

٦٤- اللهُمَّ إنّي أعُوذُ بِكَ مِنَ الخُبْـثِ والخبائِـثِ.)[٢] واتە : ئەی خودایە.. پەنات پێ دەگرم لـە شـەیتانە نێرو مێیەكان.

٦٥- أعُوذُ بِـالله مِـنَ الخُبْـثِ والخبائِـثِ.)[٣] واتـە : پەنا بە خوا دەگرم لە شەیتانە نێرو مێیەكان.

---

١ /(الإرواء : ٥٠)

٢ /.(مختصر البخاري : ٩٤)

٣ /(صحيح أبي داود : ٦)

## ١٣- ما يقول إذا خرج من الخلاء
## چی دەڵێت ئەگەر لە سەرئاو هاتە دەرەوە

٦٦- (غفرانـك)[١] واتــه : ئـەی خودایــه داوای لێخۆشبوونت لیٚ دەکەم.

## ١٤- الدعاء إذا لبس ثوباً جديداً
## نزاو پاڕانەوەی لەبەرکردنی جلوبەرگی نوێ

٦٧- اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ أَنْتَ كسَوتَنيه أسْألك مِنْ خَيْرِهِ وَخَيْرِ مَا صُنع لَهُ، وأَعُوذُ بكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ مـا صُنِعَ لَهُ.)[٢] واته : ئەی خودایه..سوپاس و ستایش بۆ تۆ، هەر تۆ پۆشتەت کردین، داوای چاکەی ئـەم

---

١ /( صحيح أبي داود : ٣٠)

٢ /(صحيح أبي داود : ٤٠٢٠)

پۆشـاكەت لێدەكـەمو داوای ئـەو خـەیرو چـاكەیەت لێدەكەم كە بۆی دروست كـراوەو پـەنات پێدەگرم لە خراپەیو لە خراپەی ئەوەی بۆی دروست كراوە.

٦٨- ومَـنْ لَـبِسَ ثَوْبـاً فَقَـالَ : الحَمْـدُ لله الـذِي كساني هذا الثوب ورَزَقَنِيـه مِـنْ غَيْـرِ حَـوْلٍ مـني ولا قُوةٍ، غُفِرَ لهُ ما تَقدَّم مِنْ ذنبِـه)[1] واتـە : هەركەسـێك پۆشـاكێكی نـوێی لەبـەركردو وتـی : سـوپاسو ستایش بۆ ئـەو خوایـەی كـە پۆشـتەی كـردم بـەم پۆشـاكەو رزقو رۆزی داویـن بـە بـێ هـیچ هێـزو توانایەكی خۆم، ئەوا لە تاوانەكانی پێشووی خۆش دەوێت.

---

١ /(صحيح أبي داود : (٤٠٢٣)

## ١٥- الدعاء لمن لبس ثوباً جديداً

## نزاو پاڕانەوە بۆ ئەو کەسەی کە جلی نوێ لەبەر دەکات

٦٩- البسْ جَدِيداً وَعِشْ حميداً ومُتْ شهيداً ويرزقك الله قرة عين في الدنيا والآخرة)[١] واته : یاخوا پۆشاکی تازە لەبەر بکەیتو بە سوپاسکراوی بژیتو بە شەهیدی سەر بنێیتەوەو بمریتو خوای گەورە هەردەم خۆشی هێنو شادی ئامێزت بە نسیب بکات لە دونیاو دوارۆژدا.

٧٠- أن رسول الله(ﷺ) أتي بكسوة فيها خميصة صغيرة فقال : (ائتوني بأم خالد) فأُتي بها،

١ /(الصحيحة :٣٥٢)، ( صحيح الجامع : ١٢٣٤)

فألبسها إياها، ثم قال : (أبلي و أخلقي) مرتين.)[١]
واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) پۆشاکێکی بچووکیان بۆ هێنا کە لە حەریر یان لە سوف دروستکرابوو ئەویش فەرمووی : بانگی دایکی خالدم بۆ بکەن، ئەوانیش دایکی خالدیان هێناو ئەویش- پێغەمبەری خوا(ﷺ)- پۆشاکەکەی پێداو لە بەری کردو ئەمجار فەرمووی : یا خوا بیڕزێنیتو پۆشاکی تر بخەیتە شوێنی (دوو جار).

٧١- (تبلي ويخلف الله تعالى)[٢] واتە: یاخوا بیڕزێنیتو خوای گەورە پۆشاکی تر بخاتەوە شوێنی.

---

١ /( صحيح أبي داود : ٤٠٢٤)

٢ /(صحيح أبي دلود : ٤٠٢٠)

## ١٦ – التسمية عند الوضوء

## وتنی (بسم الله) لە کاتی دەستنوێژدا

٧٢–لا صلاة لمن لا وضوء له ولا وضوء لمن لم يذكر اسم الله عليه)[١] واتە : نوێژی دروست نییە ئەو کەسەی دەستنوێژی نەبێتو دەستنوێژی نییە ئەو کەسەی لە سەر دەست نوێژەکەی ناوی خوا نەهێنێ.

## ١٧- الذكر عند الوضوء

## زیکرەکانی کاتی دەستنوێژ

٧٣– أشهد أنه لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله) واتە : شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن

١ /(صحيح أبي داود : ١٠١)

بێت تەنها (الله) نەبێت، تەنهاو بێهاوەڵە، وه شایەتی دەدەم کە (محمد) (ﷺ) بەندەو نێردراوی ئەوه) وزاد الترمذي : ( اللهم اجعلني من التوابين واجعلني من المتطهرين)[١] واتە : لە ریوایەتی (الترمذي) دا ئەم زیادەیه هاتووه کە دەڵێت : (ئەی خودایە بمگێڕە لە تەوبەکارانو بمگێڕە لە خۆپاك کەرەوەکان)

٧٤- سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك)[٢] واتە : پاکیو بێگەردیو سوپاس بۆ خوایە، شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها تۆ

---

١ /( الإرواء : ٩٦ )

٢ /(الصحيحة : ٢٣٣٣ -٢٦٥١)

نەبێت، داوای لێخۆشبوونت لێدەکەمو دەگەرێمـەوە بۆ لای تۆ.

## ١٨- ما يقول إذا خرج من المنزل.

## چی دەڵێت ئەگەر لە ماڵ هاتە دەرەوە

٧٥- بسم الله توكلت على الله، لا حول ولا قوة إلا بالله تعالى ، يقال له: كفيت، ووقيت وهديت،. وتنحى عنه الشيطان، فيقول لشيطان آخر: كيف لك برجل قد هدي وكفي ووقي؟)[١] واتـه : بـەناو خـوا، پشتو پەنام بـە خـوای گـەورە بەست، هـیچ هێزو توانایەك نییە تەنها بە خـوای گـەورە نـەبێت) پێـی دەگوترێـت : وتـنی ئـەو زیکـرەت بەسـە بـۆ پارێزگاریـتو پارێزرایـت لـە خراپـەی شـەیتانو

١ /(صحيح الكلم :٤٤)

ڕێنمویی کرایتو شەیتانیشی لیٚ دوور دەکەوێتەوە، جا شەیتان بە شەیتانێکی تر دەڵێت : چی دەکەیت لە کەسێك کە ڕێنمویی کراوەو وشەیەکی گوتوە کە بەسیەتی بۆ پارێزگاریو پارێزراوە لە خراپەی شەیتان)

٧٦–بسم الله توكلت على الله ، اللهم إني اعوذ بك أن أضل أو أُضل، أو أزل أو أُزل ، و أظلم أو أُظلم ،أو أجهل أو يجهل علي أو أن أبغي أو يبغى علي)[1]

واتە : بە ناوی خوا.. پشتو پەنام بە خوای گەورە بەست.. ئەی خودایە.. من پەنات پیٚ دەگرم لەوەی کە خەڵك گومڕا بکەم یان گومڕا بکرێم.. یان هەڵە بە خەڵکی بکەمو یان هەڵەم لە گەڵ بکریٚ..

---

١ / (هداية الرواة : ٢٣٧٦ (,(الصحيحة : ٣١٦٣)

یان ستەم بکەم لە خەڵکی‌و لەوەی کە ستەمم لێ بکرێت..یان نەفامی بکەم یان نەفامیم لە گەڵ بکرێت.. یان ستەم‌و زیان بە خەڵکی بگەیەنم یان خەڵکی ستەم‌و زیانم پێ بگەیەنن – دەستدرێژی بکەمە سەر خەڵکی یان دەستدرێژیم بکرێتە سەر.

**صلاة رکعتین (ئەنجامدانی دوو رکات نوێژ)..**

٧٧– إذا خرجت من منزلك فصل رکعتین یمنعانك من مخرج السوء، وإذا دخلت الی منزلك فصل رکعتین یمنعانك من مدخل السوء)[١] واتە : ئەگەر لە ماڵ دەرچوویت، ئەوا دوو رکات نوێژ بکە چیتر لە خراپەی دەرگای دەرچوون دەتپارێزی‌و ئەگەر چوویتە ژوورەوە بۆ ماڵەکەی خۆت ئەوا دوو

١ /(الصحیحة : ١٣٢٣)

ركات نوێژ بكە چیتر دەتپارێزی لە خراپەی دەرگای هاتنەژوورەوە.

## ١٩- الذكر عند دخول المنزل

## زیکرکانی کاتی چوونە ژوورەوە بۆ ماڵ

٧٨- إذا دخل الرجلُ بَيتَهُ, فَذكَرَ اللهَ تعالى عند دخوله, وعند طعامه قال الشّيطان: لا مبيتَ لكم, ولا عَشاءَ, وإذا دخل فلم يذكر الله تعالى عند دخوله, قال الشيطان: أدركتُم المبيتَ, وإذا لم يذكر الله تعالى عند طعامه قال: أدركتُم المبيتَ والعَشاء.)[١]

واتە : ئەگەر هەر کاتێك کەسێك چووە ژوورەوە بۆ ماڵەکەی خۆیو یادی خوای گەورەی کرد لە کاتی چوونە ژوورەوەیو لە کاتی خواردنیدا، شەیتان

---

١ /(مختصر مسلم : ١٢٩٧)

دەڵێت : شوێنی خەوتنو خواردنی شێوانتان دەست نەکەوت، بەڵام ئەگەر چووە ژوورەوە یادی خوای نەکرد لە کاتی چوونە ژوورەوەیدا ئەوا شەیتان دەڵێت : شوێنی خەوتنتان دەستکەوت، وە ئەگەر یادی خوای نەکرد لە کاتی خواردنەکەیدا ئەوا –شەیتان– دەڵێت : شوێنی خەوتنو خواردنی شێوانتان دەستکەوت.

٧٩–یا بني ! إذا دخلت على أهلك فسلم، يكن بركة عليك وعلى أهل بيتك)[١] واتە : ئەی کوڕە شیرینەکەم.. ئەگەر چوویتە ماڵەکەی خۆت ئەوا سڵاو لە کەسوکارەکەت بکە، چونکە دەبێتە مایەی بەرەکەت بۆ سەر خۆتو بۆ سەر کەسوکارەکەت.

---

١ / ( صحيح الكلم : ٤٧)، ( هداية : ٤٥٧٥)

٨٠- ثلاثة كُلُّهم ضَامِنٌ على الله إن عاش رزق و كفي وإن مات أدخله الله الجنة من دخل بيته فسلم فهو ضامن على الله...)[١]. واته : سێ كەس هەن لە لایەن خوای گەورەوە زامنن ئەگەر بژێت ئەوا ڕزقی دەدرێتو پێویستی بە كەس نییەو ئەگەر بمرێت خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە... هەركەسێك بگەڕێتەوەماڵەوە بە سڵاوكردن ئەوا زامنە لە لایەن خوای گەورەوە...).

٨١-صلاة ركعتين : ((إذا خرجت من منزلك فصل ركعتين يمنعانك من مخرج السوء، وإذا دخلت إلى منزلك فصل ركعتين يمنعانك من مدخل السوء))[٢]

---

١ /(صحيح الترغيب : ٣١٩ )، ( صحيح الجامع : ٣٠٥٣)

٢ /( الصحيحة : ١٣٢٣)

واتـه : ئەنجامـدانی دوو ركـات : (ئەگـەر لـە مـاڵ دەرچـوويت، ئـەوا دوو ركـات نوێـژ بكـە چـيتر لـە خراپـەی دەرگـای دەرچـوون دەتپـارێزیو ئەگـەر چوويتە ژوورەوە بۆ ماڵەكەی خۆت ئـەوا دوو ركـات نوێـژ بكـە چـيتر دەتپـارێزی لـە خراپـەی دەرگـای هاتنە ژوورەوە.

## ٢٠- دعاء الخروج الى المسجد

## پاڕانەوەی دەرچوون بۆ مزگەوت

٨٢- اللـهم اجعـل في قلـبي نـوراً ، ، وفي بـصري نـوراً ، وفي سمعـي نـوراً، وعـن يمـيني نـوراً، وعـن يساري نوراً ، وفـوقي نـوراً، وتحـتي نـوراً ، وأمـامي نوراً، وخلفـي نـوراً، وعظـم لـي نـوراً.)[1] واتـه : ئـەی

---

١ /( مختصر البخاري : ٩٢ )

خودایە... نورو روناکی بخە دڵمەوە، نورو روناکی بخەرە بینینمەوە، نورو روناکی بخەرە بیستنمەوە، نورو روناکی بخەرە راستمەوە، نورو روناکی بخەرە لای چەپمەوە، نورو روناکی بخەرە سەرەوەم، نورو روناکی بخەرە ژێرەوەم، نور روناکی بخەرە پێشمەوە، نورو روناکی بخەرە پاشمەوە، نورو روناکیم بۆ گەورە بکەرەوە).

## ٢١- الدعاء عند دخول المسجد
## پاڕانەوەی کاتی چوونە مزگەوت

٨٣- أعوذ بالله العظيم و بوجهه الكريم وسلطانه القديم، من الشيطان الرجيم))[١] واتە : پەنا ئەکرم بە

---

١ /( صحيح أبي داود : ٤٨٥)

خـــوای مـــەزن‌و بـــە ڕووی بـــەڕێزی‌و دەســـتەڵاتی هەربوی بەردەوامی لە شەیتانی نەفرەت لێکراو.

٨٤–بسم الله والـصلاة والـسلام علـى رسـول الله، اللهم افتح لي أبواب رحمتك.)[1] واته : به ناوی خوای گەورە، صەلات‌و سەلام لـە سـەر پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)، ئەی خوایە.. دەرگاکانی ڕەحمەتی خۆتم لـێ بکەرەوە.

قـال الـشيخ – رحمـه الله – كـان عليـه الـصلاة والـسلام يقـول إذا خـرج مـن المـسجد : ((بـسم الله، اللهم صل على محمد وسلم ، اللـهم افـتح لـي أبـواب رحمتك))[2].

١ /( صحيح ابن ماجة : ٦٣٢)، (تمام المنة : ٢٩٠)، ( تراجع العلامة : ٥١٠).
٢ /( الثمرة المستطاب : ٦٠٤ )

واتــه : شــەیخ – ڕەحمــەتی خــوای لێبێــت – فەرموویــەتی : پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) ئەگــەر لــە مزگــەوت دەرچــوایە دەیفــەرموو: بــە نــاوی خــوای گەورە، ئەی خوادایە...صەلاتو سەلام برژێنــە بــە ســەر پێغەمبــەری خــوادا (ﷺ), ئــەی خودایــە.. دەرگاکانی ڕەحمەتی خۆتم لێ بکەرەوە.

٨٥ – ((بسم الله والسلام على رسول الله، اللهم صل على محمد وعلى آل محمد وسهل لنا أبواب رحمتك)[١] .واتە : بە ناوی خوای گەورە، سەلام لە ســــەر پێغەمبــــەری خـــوا (ﷺ)، ئـــــەی خوادایــە...صــەلاتو ســەلام برژێنــە بــە ســەر پێغەمبــەری خــوا (ﷺ)و ئــالی پێغەمبــەری خــوادا

١ /( فضل الصلاة على النبي(ﷺ) : ٧٢)

(ﷺ)، دەرگاکانی رەحمەتی خۆتمان لێ سووکو ئاسان بکەرەوە.

## ٢٢- الدعاء عند الخروج من المسجد

## پاڕانەوەی دەرچوون لە مزگەوت

٨٦ – بسم الله والصلاة والسلام على رسول الله (ﷺ)، اللهم افتح لي أبواب فضلك))[1] واتە : بە ناوی خوای گەورە، صەلاتو سەلام لە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەی خوایە.. دەرگاکانی فەزڵی خۆتم لێ بکەرەوە.

٨٧- إذا خرج فليسلم على النبي (ﷺ) وليقل اللهم اعصمني من الشيطان الرجيم)[2] واتە : ئەگەر

---

١ /(صحيح ابن ماجه : ٦٣٢)، (تمام المنة : ٢٩٠)، (تراجع العلامة : ٥١٠)

٢ /( صحيح ابن ماجه : ٧٨٠ )

لــه مزگــەوت دەرچــوو بــا ســەلام بنێرێــت بــۆ پێغەمبــەری خــوا (ﷺ)و بڵێــت : ئــەی خودایــە لــە شەیتانی نەفرەت لێکراو بمپارێزە.

٨٨- (إذا خرج -أحدكم من المسجد- فليسلم علــى الــنبي (ﷺ) وليقــل : اللــهم إنــي أســألك مــن فــضلك))[١] واتــە : ئەگــەر یــەکێکتان لــە مزگــەوت دەرچوو با سەلام بنێرێت بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)و بڵێت : ئەی خودایە.. من داوای فەزڵی تۆ دەکەم.

٨٩- بــسم الله، والــسلام علــى رســول الله (ﷺ)، اللهم صل علــى محمــد وعلــى آل محمــد.. وســهل لنــا أبواب فضلك)[٢] واتە: بە ناوی خوا، ســەلام لــە ســەر

---

١ /( صحيح أبي داود : ٤٨٤)

٢ /( فضل الصلاة على النبي (ﷺ) : ٧٢ )

پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەی خودایە صەڵاوات بنێرە بۆ محمدو کەس وکاری محمد.. وە دەرگاکانی فەزڵی خۆتمان بۆ سووك وئاسان بکەرەوە.

## ٢٣- فضل الأذان

## فەزڵی بانگدان

٩٠- لو يعلم الناس ما في النداء والصف الأول، ثم لم يجدوا إلا أن يستهموا عليه لاستهموا، ولو يعلمون ما في التهجير لاستبقوا إليه، ولو يعلمون ما في العتمة والصبح لأتوهما ولو حبواً))[١] واتە : ئەگەر خەڵكی دەزانن چی لە بانگو ریزی یەکەمدا هەیە — لە پاداشت— ئەمجار هیچ چارەیەکیان نەبوایە بۆ دیاری کردنی بانگدەرو ریزی یەکەم تەنها بە

---

١ /(صحيح الترغيب : ٢٣١)

قورعەکردن نەبێت ئەوا قورعەیان بۆ دەکرد، وە ئەگەر خەڵکی بزانن چی لە زووهاتندایە بۆ مزگەوت – بۆ نوێژی نیوەڕۆ لە پاداشت– ئەوا پێشبرکێیان بۆ دەکرد، وە ئەگەر بزانن چی لە نوێژی عیشاو بەیانیدا هەیە – لە پاداشت – ئەوا بۆی دەهاتن ئەگەر بە گاگۆڵکێیش بوایە.

٩١– المؤذن يغفر له مدى صوته، ويشهد له كل رطبٍ ويابسٍ، وله مثل أجر من صلى معه)[١] واتە : بانگدەر بە ئەندازەی ئەوەی دەنگی دەیگاتێ خوای گەورە لە تاوانەکانی خۆش دەبێت[٢]، وە

---

١ /( صحيح الترغيب : ٢٣٤)

٢ / بۆ ڕاڤەکردنی ئەم فەرموودەیە چەند بۆچوونێك هەیە هەندێك دەڵێن : واتە ئەگەر گەورەیی تاوانەکانی بە ئەندازەی ئەوەی دەنگی پێدەگات گەورە بێت ئەوا خوای گەورە لێیّ خۆش دەبێت.

هەموو تەڕو وشکێك شایەتی بۆ دەدەنو پاداشتی بە قەد ئەوانە هەیە کە لە گەڵیدا نوێژیان کردوە).

٩٢- (المؤذنون أطول الناس أعناقا يوم القيامة))[١] واتە : بانگدەران لە هەموو خەڵکی زیاتر گەردنیان درێژترە لە ڕۆژی قیامەتدا.

٩٣- من أذن اثنتي عشرة سنة وجبت له الجنة، وكُتب له بتأذينه في كل يوم ستون حسنة، وبكل إقامة ثلاثون حسنة)[٢] واتە : هەر موسڵمانێك دوازدە ساڵ بانگ بدات ئەوا بەهەشتی بۆ واجب دەبیٚو بۆ هەموو بانگێك لە ڕۆژێکدا شەست چاکەی بۆ دەنوسرێتو بۆ هەر قامەتێکیش سی چاکەی بۆ دەنوسرێت).

---

١ /(صحيح الترغيب : ٢٤٢)

٢ /(صحيح الترغيب : ٣٤٨)

## ٢٤- الذكر عند سماع المؤذن
## زیکری کاتی بیستنی بانگ

٩٤- ((إذا سمعتم النداء فقولو مثل ما يقول المؤذن))[١] واته : ئەگەر گوێتان لە بانگ بوو ئەوا ئەوەی کە بانگدەر دەیڵێت ئێوەش بیڵێن.

٩٥- إذا قال المؤذن : الله أكبر، الله أكبر، فقال أحدكم : الله أكبر الله أكبر، ثم قال: أشهد أن لا إله إلا الله قال : أشهد أن لا إله إلا الله ثم قال : أشهد أن محمدا رسول الله، قال : أشهد أن محمدا رسول الله، ثم قال : حي على الصلاة، قال : لا حول ولا قوة إلا بالله، ثم قال : حي على الفلاح قال : لا حول ولا قوة إلا بالله ثم قال : الله أكبر، الله أكبر، قال: الله

---

١ /( صحيح الكلم : ٥٤)

أكبر الله أكبر، ثـم قـال: لا إلـه إلا الله قـال: لا إلـه إلا الله من قلبـه، دخـل الجنـة.)[١] واتـه: ئەگـەر بانگـدەر گوتـی : (الله أكبر، الله أكبر) یەکێك لە ئێوە گـوتـی : (الله أكبر الله أكبر) ئەمجار گوتـی : (أشـهد أن لا إلـه إلا الله) گـوتـی : (أشـهد أن لا إلـه إلا الله) ئـەمجار گوتـی : (أشهد أن محمدا رسول الله) گوتـی : (أشـهد أن محمـدا رسـول الله) ئـەمجار گـوتـی : (حـي علـى الصلاة) گوتـی : (لا حـول ولا قـوة إلا بـالله) ئـەمجار گوتـی : (حي على الفلاح) گوتـی : (لا حـول ولا قـوة إلا بالله) ئەمجار گوتـی : (الله أكبر، الله أكبر) گوتـی : (الله أكبر، الله أكبر) ئـەمجار گـوتـی : (لا إلـه إلا الله)

---

١ /(صحيح الكلم : ٥٦)

گوتی : (لا إلـه إلا الله) لـه دڵییـه‌وه، ئـه‌وا ده‌چێته به‌هه‌شته‌وه .

٩٦–من قال حين يسمع المؤذن(يتـشهد) : وأنـا أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك لـه وأن محمـدا عبـده ورسـوله، رضـيت بـالله ربـا، وبمحمـد رسـولا، وبالإسلام دينا، غفر لـه)[١] واتـه : هـه‌ر كه‌سـێ بڵێـت كاتێ گوێبیستی بانگده‌ر بـوو ده‌ڵێـت (اشـهد أن لا إلــه إلا الله وأشــهد محمــد رســول الله) :– منـیش شـایه‌تی ده‌ده‌م كـه هـیچ خوایـه‌ك نییـه شایـسته‌ی په‌رستن بێت ته‌نها (الله) نه‌بێت، ته‌نهاو بێ هاوه‌ڵه‌و (محمـد) (ﷺ)یـش به‌نـده‌و نێـردراوی ئـه‌وه. رازیـم به‌وه‌ی كـه (الله) پـه‌روه‌ردگارم بێـت‌و (محمـد) یـش

١ /(صحيح أبي داود :٥٣٧، ط غراس )

پێغەمبەر (ﷺ)و ئیسلام دینو ئاینم بێت. ئەوا لە تاوانەکانی خۆش دەبێت.

٩٧- إذا سمعتم المؤذن فقولوا مثل ما يقول، ثم صلوا عليَّ، فإنه من صلى علي صلاة، صلى الله عليه بها عشرا. ثم سلوا لي الوسيلة فإنها منزلة في الجنة لا تنبغي إلا لعبد من عباد الله، وأرجو أن أكون أنا هو، فمن سأل لي الوسيلة، حلت له الشفاعة)[١] واتە : ئەگەر گوێبیستی بانگدەر بوون ئەوەی کە ئەو دەیڵێت ئێوەش بیڵێن، ئەمجار صەڵاوات بنێرن بۆ من چونکە هەرکەسێك یەکجار صەڵاواتم بۆ بنێرێ ئەوا خوای گەورە بە هۆی ئەو صەڵاواتەوە دە جار صەڵاواتی بۆ دەنێرێ، ئەمجار

---

١ /(صحيح الكلم : ٥٥)

داوای (الوسیله)م بۆ بکەن، ئەوە جێگاو پایەیەکە لە بەهەشتدا بۆ هیچ کەسێك نییە تەنها بۆ بەندەیەکە لە بەندەکانی خوا، تکام وایە کە ئەو بەندەیە من بم، جا هەر کەسێك داوای (الوسیله) م بۆ بکات ئەوا شەفاعەتی منی بۆ حەڵاڵە –بەر شەفاعەتی من دەکەوێت– .

٩٨– من قال حين يسمع النداء((اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة آت محمداً الوسيلة والفضيلة ، وأبعثه مقاماً محموداً الذي وعدته، حلت له شفاعتي يوم القيامة)[١] واته : هەر کەسێك گوێبیستی بانگ بوو بڵێت : ئەی خودایە..پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوەو نوێژ

١ /( مختصر البخاري : ٣٢٦)

دامەزراوە، ببەخشە بە پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) پلەوپایەی بەرزی (الوسیلە)و پلەوپایەی زیادە بە سەر دروستکراوەکان (الفضیلة)و بیبەرە ئەو شوێنە سوپاسکراوەی کە بەڵێنت پێداوە، ئەوا شەفاعەتی منی بۆ حەڵاڵ دەبێت لە رۆژی قیامەتدا (یان بەر شەفاعەتی من دەکەوێت لە رۆژی قیامەتدا)

٩٩- الدعاء لا یرد بین الأذان والإقامة))[١] واتە : پاڕانەوەی نێوان بانگو قامەت هەرگیز رەت ناکرێتەوە.

١٠٠- الدعاء بین الأذان والإقامة مستجاب فادعوا))[٢] واتە : پاڕانەوەی نێوان بانگو قامەت

---

١ /(صحیح الترمذي : ٢١٢)

٢ /(صحیح الموارد : ٢٥٥)

وەڵام دەدرێتـــەوە بۆیـــە لـــەو کاتـــەدا لـــە خـــوا بپارێنەوە.

## ٢٥- استفتاح الصلاة

## پاڕانەوەی دەستپێکردنی نوێژ

١٠١ – اللهم باعد بيني وبين خطاياي كما باعدت بين المشرق والمغرب ، اللهم نقني من خطايـاي كمـا ينقى الثوب الأبـيض مـن الـدنس اللـهم اغسلني مـن خطاياي بالثلج والماء والبرد)[١] واتە : ئەی خودایە.. نێوان منو تاوانەکانم دوور بخەرەوە هەروەکو چۆن ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوات لە یەك دوور خستۆتەوە، ئـەی خودایـە.. لـە تاوانـەکانم پـاکم بکـەرەوە هـەروەکو چۆن کراسی سپی لـە چڵك پـاك دەکرێتـەوە، ئـەی

١ /(صفة الصلاة : ٩١)

خودایە.. لە تاوانەکانم بمشۆرەوە بە بەفرو ئاوو تەرزە.

١٠٢ – الله أكبر كبيرا ، والحمد لله كثيرا ، وسبحان الله بكرة وأصيلا (ثلاثاً) أعوذ بالله من الشيطان الرجيم من نفخه ونفثه وهمزه))[١] واتە: خوا گەورەیەو شایستەی گەورەییە(هەرە گەورەیە)، سوپاس‌و ستایشێکی زۆرو بێ پایان بۆ خوا، پاکی‌و بێگەردی بۆ خوا بەیانیان‌و ئێواران (سێ جار) پەنا دەگرم بە خوا لە شەیتانی نەفرەت لێکراو لە فیززلی‌و شیعرو وەسوەسەو شێتی ئەو.

١٠٣ – سبحانك اللهم وبحمدك وتبارك اسمك وتعالى جدك ولا إله غيرك)) ويزيد في صلاة الليل :

---

١ /(صحيح الكلم : ٦٢)

(لا إلـه إلا الله (ثلاثـاً) الله أكـبر كـبيرا(ثلاثـاً)[١].واتـه: پاكیو بێگەردیو سوپاسو ستایش تەنها بۆ تۆیە –ئەی خودایە–و ناوی تۆ پیرۆزو بەرەكـەتی زۆرەو دەسـەڵاتت گـەورەو بڵنـدەو هـیچ خودایـەك نییـە شایستەی پەرستن بێت جگـە لـە تـۆ) وە لـە شـەو نوێـژدا ئـەوە دەڵێـت پاشان دەڵێت: لا إلـه إلا الله (سێ جار) الله أكبر كبيرا (سێ جار).

١٠٤ – (الحمد لله حمداً كثيراً طيباً مباركاً فيه))[٢] واتــه : ســوپاسو ســتایش بــۆ خــوای گــەورە سوپاسێكی زۆرو پاكو پیرۆزو پڕ بەرەكەت.

١٠٥ – وجهت وجهي للذي فطر السموات والأرض حنيفا وما أنـا مـن المشركين ، إن صـلاتي ونـسكي

---

١ /(صفة الصلاة : ٩٣)

٢ /( صفة الصلاة : ٩٤)

ومحياي ومماتي لله رب العالمين لا شريك لـه وبذلك أمرت وأنا أول المسلمين ، اللهم أنت الملك لا إلـه إلا أنت ، سبحانك وبحمدك أنت ربي وأنـا عبـدك ظلمـت نفسي واعترفت بذنبي فاغفر لي ذنوبي جميعا إنـه لا يغفـر الـذنوب إلا أنـت ، واهـدني لأحـسن الأخـلاق لا يهـدي لأحـسنها إلا أنـت ، واصـرف عـني سـيئها لا يصرف عني سيئها إلا أنت ، لبيك وسعديك والخـير كله في يديك ، والشر ليس إليـك والمهـدي مـن هـديت أنا بك وإليك لا منجا ولا ملتجأ منك إلا إليـك تباركـت وتعاليـت أسـتغفرك وأتـوب إليـك)) (كـان يقولـه في الفـرض والنفـل)[1] واتـه : بـه پـاكىو دڵـسۆزى ڕووم كرده ئەو خوايەى ئاسمانەكانو زەوى بـەديهێناوەو مـن لــە هاوبـەش دانـەران نـيم، بـە راسـتى نوێـژو

١ /( صفة الصلاة : ٩٢)

سەربڕینو ژیانو مردنم تەنها بۆ پەروەردگاری جیهانیانەو ئەو بێ هاوەڵەو بەوە فەرمانم پێکراوەو من یەکەم موسڵمانانم، ئەی خودایە.. تۆ پادشایتو هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ، پاکیو بێگەردیو سوپاسو ستایش بۆ تۆیە، تۆ پەروەردگاری منیو منیش بەندەی تۆم، ستەمم لە نەفسی خۆم کردوەو دان دەنێم بە تاوانەکانمدا،بۆیە خوایە لە هەموو تاوانەکانم خۆش بە، بە راستی جگە لە تۆ هیچ کەسێك لە تاوانەکان خۆش نابێت، رێنمویم بکە بۆ چاکترینو جوانترین رەوشت، هیچ کەسێك رێنمویی ناکات بۆ چاکترین رەوشتو ئاکار جگە لە تۆ، کردەوەی خراپم لێ دوور بخەرەوە هیچ کەسێك کرداری خراپم لێ دوور ناخاتەوە جگە لە تۆ، ئەی خودایە.. وەڵامی دوای

وەڵامدانــەوەم هەیــە بــۆت لــە گــوێ رایەڵیتــداو شوێنکەوتنی دوای شوێنکەوتنم هەیە بۆ دینەکـەت، چاکە هەمووی بە دەستی تۆیـەو خراپـەش نادەمـە پـاڵ تـۆ، رێنمـوییکراو ئـەو کەسـەیە تـۆ رێنموییـت کردووەو من بە تۆوە هەمو بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە، هیچ پەناگەیەك نییە لە تۆ تەنها بۆ لای تـۆ نـەبێت، پاکیو بێگـەردیو بڵنـدی بـۆ تۆیـە، داوای لێخـۆش بوونت لێدەکەمو دەگەڕێمەوە بۆ لات.) ئەمـەی لـە فەرزو سوننەتەکاندا دەیفەرموو.

١٠٦- كـان يفتـتح صـلاته، إذا قـام مـن الليـل : ((اللــهم رب جبريــل وميكائيــل وإســرافيل فــاطر السموات والإرض عـالم الغيـب والـشهادة أنـت تحكـم بين عبـادك فيمـا كـانوا فيـه يختلفـون ، اهـدني لمـا اختلـف فيه من الحق بإذنك إنك تهـدي مـن تـشاء إلى

علیك وعلى اهل بيتك)[١] واتە : لە ئەنەسەوە ریوایەت کراوە کەوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی : ئەی کوڕەکەی خۆم !! ئەگەر چوویتە ماڵەکەی خۆت ئەوا سڵاویان لێ بکە، ئەوا دەبێتە هۆی بەرەکەت بە سەرتەوەو بە سەر کەسوکارەکەتەوە)

٢٢٨–إذا دخل الرجل بيته، فذكر الله –عز وجل– عند دخوله وعند طعامه، قال الشيطان: لا مبيت لكم ولا عشاء، وإذا دخل فلم يذكر الله عند دخوله، قال الشيطان أدركتم المبيت وإذا لم يذكر الله عند طعامه قال أدركتم المبيت والعشاء)[٢] واتە : ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە چووە ماڵەکەی خۆیو

١ /(هداية الرواة :٤٥٧٥)

٢ /( مختصر مسلم : ١٢٩٧)

ناوی خوای هێنا لە کاتی چوونە ژوورەوەو لە کاتی نانخواردنیدا، ئەوا شەیتان – بە هاوڕێکانی – دەڵێت : نە جێگای حەوانەوەتان بۆ هەیەو نە خۆراکیش، بەڵام ئەگەر یەکێکتان لە کاتی چوونە ماڵەوەیدا ناوی خوای نەهێنا، ئەوا شەیتان – بە هاوڕێکانی – دەڵێت : ئەوا جێگای حەوانەوەتان دەستکەوتو ئەگەر لە کاتی نانخواردنیدا ناوی خوای نەهێنا ئەوا دەڵێت : جێی حەوانەوەو خواردنیشتان دەستکەوت).

٢٢٩– ثلاثة كلُّهم ضَامِنٌ على الله إن عاش كفي وإن مات دخل الجنة : من دخل بيته بسلام، فهو ضامن على الله عز وجل.)[1] واتە : سێ کەس

١ /(صحيح الأدب المفرد : ٨٣٢)

هەموویان مسۆگەرو زامنن لە ژێر چاودێری خوای گەورەدان، ئەگەر ژیا بەسیەتیو ئەگەر مرد ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە، هەرکەسێك بگەڕێتەوە ماڵەکەی خۆی بە سڵاوکردن ئەوا زامنو مسۆگەرە لە لایەن خوداوە)

٢٣٠- عن أبي الزبير أنه سمع جابر يقول : إذا دخلت على أهلك فسلم عليهم تحية من عند الله مباركة طيبة)[١] واتە : لە باوکی زوبێرەوە ریوایەت کراوە کە گوێی لێبووە جابر فەرموویەتی : ئەگەر چوویتە ماڵەوەت ئەوا سڵاویان لێ بکە بە سڵاوێك لە لایەن خوای گەورەوە پڕ بەرەکەت پاكو خاوێنو باش)٠

---

١ /(صحيح الأدب المفرد : ٨٣٣)

## ٦٥- السلام على المصلي والرد بالإشارة
## سڵاوکردن لە نوێژەرو وەڵامدانەوەی بە ئیشارەت

٢٣١- عن ابن عمر قال : فقلت لبلال : كيف رأيت رسول الله يرد عليهم حين كانوا يسلمون عليه وهو يصلي؟ قال: يقول هكذا وبسط جعفر بن عون كفه وجعل بطنه أسفل وجعل ظهره إلى فوق)[١] واتە: لە ئیبن عومەرەوە ریوایەت کراوە کەوا فەرمویەتی: بە بیلالم گوت: چۆن پێغەمبەری خوات (ﷺ) دەبینی وەڵامی دەدایەوە کاتی ئەوان سڵاویان لێ بکردبایە لە کاتی نوێژدا؟ فەرمووی: دەیفەرموو ئا بەم شێوەیە، جا (جەعفەری کوڕی عەون) لەپی خۆی ڕاخستو ئەمجار ناو لەپی خۆی بەرەو خوار کردەوەو پشتی دەستی بۆ سەرەوە.

---

١ / (صحيح أبي داود : ٨٦٠)

٢٣٢- عن صهيب أنه قال : مررت برسول الله (ﷺ) وهو يصلي فسلمت عليه فرد إشارة)[١] واته : له (صهيب)ەوە ریوایەت کراوە کەوا فەرموویەتی : بە تەنیشت پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) تێپەڕیم لە کاتێکدا نوێژی دەکرد منیش سڵاوم لێکرد ئەویش بە ئیشارەت وەڵامی دامەوە.

٢٣٣- أن رجلاً سلم على رسول الله (ﷺ) وهو في الصلاة فرد النبي (ﷺ) بإشارة فلما سلم..)) کابرایەك سڵاوی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد لە کاتێکدا ئەو لە نوێژدا بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ئیشارەت وەڵامی دایەوە کاتی لە نوێژەکە سەلامی دایەوە......

١ /(صحيح الترمذي : ٣٦٧)

٢٣٤– قال له النبي (ﷺ) : (إنا كنا نرد السلام في صلاتنا فنهينا عن ذلك) واته : پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) پێی فه‌رمووه : ئێمه له نوێژه‌کانماندا وه‌ڵامی سه‌لاممان ده‌دایه‌وه پاشان له‌وه نه‌هیمان لێکرا.

قال الشيخ –رحمه الله– : وفي الحديث دلالة صريحة أن رد السلام من المصلي لفظاً كان مشروعاً في أول الإسلام في مكة ثم نسخ إلى رده بالإشارة في المدينة وإذا كان ذلك كذلك ففيه استحباب إلقاء السلام على المصلي لإقراره (ﷺ) ابن مسعود على (إلقائه) كما أقر على ذلك غيره ممن كان يسلمون عليه وهو يصلي.. وعلى ذلك، فعلى أنصار السنة التمسك بها والتلطف في تبليغها وتطبيقها فإن الناس

أعداء لما جهلوا. ا هـ)[١] شـەيخ فەرموويـەتی : لـەم فەرموودەيەدا بەڵگەيەكی روونو ئاشكرا هەيە كـەوا وەڵام دانەوەی سڵاو لە لايەن نوێـژەرەوە بـە گوتـە دروست بـووە لـە سـەرەتای ئيـسلامەوە لـە شـاری مەككە پاشان نەسخ كرايەوە لە شـاری مەدينـە بـە ئيشارەت، ئەگەر وا بێ ئەوە دروستەو (مستحب) ە كـە سـڵاو بكـەی لـە نوێـژەر لـە بـەر رازی بـوونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئيبن مسعود كاتێ سـڵاوی لێكـردووەو هــەروەها رازی بــووە كــە جگــە لــەو سڵاويان لێكردووە لە كاتێكدا ئـەو نوێـژی دەكـرد.. جا بۆيە پێويستە پشتيوانانی سوننە دەستی پێـوە

١ /(الصحيحة : ٦/٩٩٩)

بگرنو نەرمو نیان بن لە گەیاندنو جێبەجێکردنیـدا چونکە خەڵکی دوژمنی ئەوەن کە نایزانن.

## ٦٦- لا تبدءوا اليهود والنصارى بالسلام دەستپێشخەری جولەکەو گاور مەبن بە سڵاوکردن

٢٣٥- لا تبدءوا اليهود ولا النصارى بالسلام وإذا لقيتم أحدهم في طريق فاضطروه إلى أضيقه)[١] واتە : دەستپێشخەری جولەکەو گاور مەبن بە سـڵاوکردن، ئەگەر بە یەکێکیان لە ڕێگادا گەیشتن ئـەوا ناچـاری بکەن بۆ تەنگترین ڕێگە).

١ /(مختصر مسلم : ١٤٣٢)

## ٦٧- كيف يرد السلام على الكافر
## چۆن وەڵامی سڵاوی بێباوەڕ دەدرێتەوە

٢٣٦- قال (ﷺ): (إني راكب غداً الى اليهود، فلا تبدءوهم بالسلام فإذا سلموا عليكم فقولوا: وعليكم)[١] واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: من سبەینێ دەچم بۆ لای جولەكەكان، بۆیە ئێوە دەستپێشخەری سڵاو مەبن جا ئەگەر ئەوان سڵاویان لێكردن ئەوا بڵێن : بۆ خۆتانیش)

قال الشيخ -رحمه الله-: وعلل ذلك في حديث.واتە: شەیخ فەرموویەتی: هۆی ئەوە لەم فەرمودەیەی داهاتوودا روونكردوەتەوە.

---

١ /(صحيح الأدب المفرد : ٨٣٩)

٢٣٧- عن ابن عمر قال: قال رسول الله (ﷺ): إذا سلم عليكم اليهود فإنما يقول أحدهم : السام عليك فقل : وعليكم)[1] ابن عومەر دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر جولەکە سلاوی لێکردن ئەوا پێتان دەڵێت: سام بۆ ئێوە (واتە : مردن) ئێوەش بڵێن : بۆ خۆتانیش)

-وهذا يعني أن الكافر إذا سلم سلاماً واضحاً (السلام عليكم) أنه يرد عليه بالمثل، وهو الذي أذهب إليه ونصرته في الصحيحة.)[2] واتە : ئەمەش مانای ئەوەیە ئەگەر بێباوەڕێك سلاوێکی روونو ئاشکرای لێکردنو وتی (السلام عليكم) ئەوا

---

١ /( مختصر البخاري ٢٤٠٥)

٢ /(٢/٣٢٨)اهـ(صحيح الأدب المفرد : ص ٤٢٥)

هەروەکو خۆی وەڵامی بدەنـەوە، هـەر ئـەم رایـەش من بۆی دەچم لە (الصحیحە) دا سەرمخستوە.

## ٦٨- دعاء دخول السوق

## ( پاڕانەوەی چوونە بازار)

٢٣٨–لا إله إلا الله وحده لا شريك لـه، لـه الملـك وله الحمد، (يحيي ويميـت وهـو حـي لا يموت بيـده الخير) وهو على كل شئ قدير، كتب الله له ألف ألف حسنة، ومحا عنه ألف ألف سيئة، ورفع له ألف ألف درجـة)[1] واتـە : هـیچ پەرسـتراوێك نییـە شایـستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت، تەنهاو بێ هاوەڵە، موڵكو سوپاسو ستایش تەنها بۆ ئەوە، هـەر ئـەو زیندوو دەکاتەوەو دەمرێنێتو زینـدووەو نامرێـتو

١ /(الصحيحة : ٣١٣٩) (صحيح الكلم الطيب : ١٤٤)

هەموو خەیرێك بە دەستی ئەوەو توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە، ئەوا هەزار هەزار چاکەی بۆ دەنوسرێتو هەزار هەزار تاوانی لەسەر دەسڕێتەوەو هەزار هەزار پلەی بەرز دەبێتەوە).

## ٦٩- الدعاء لمن غلبه الدين
## ( پاڕانەوەی ئەو کەسەی قەرزاری زاڵ بووە بە سەریدا )

٢٣٩- اللهم اكفني بحلالك عن حرامك وأغنني بفضلك عمن سواك.)[١] واتە : ئەی خودایە.. بە حەڵاڵەکانی خۆت لە حەرامەکانت بێ نیازم بکەو بە فەزڵی خۆت لە جگە لە خۆت دەوڵەمەندم بکە.

١ /( الصحيحة : ٢٦٦)، (صحيح الكلم : ١١٦)

٢٤٠– اللهم إني أعوذ بك من الهم والحزن والعجز، والكسل، والبخل، والجبن، والهرم، وأرذل العمر وأعوذ بك من عذاب القبر وأعوذ بك من فتنة الدجال وفتنة المحيا والممات وضلع الدين وغلبة الرجال.)[١]

واتە : ئەی خودایە من پەنات پێ دەگرم لە خەمو پەژارەو بێهێزیو تەمبەڵیو رەزیلیو ترسنۆکیو پەککەوتنو خوارترین پلەی تەمەن (پەککەوتەیی) وە پەنات پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕو پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی دەجالو فیتنەی ژیانو مردنو بوون بە ژێر باری قەرزەوەو زاڵبوونی دوژمنان.

١ /(مختصر البخاري : ١٢٣٤)

## ٧٠- دعاء من استصعب عليه الأمر
## پاڕانەوەی كەسێك كارێكی لا گران بوو

٢٤١- اللهم لا سهل إلا ما جعلته سهلاً وأنت تجعل الحزن إذا شئت سهلاً)[1] واتە : ئەی خودایە هیچ شتێك سووكو ئاسان نییە تەنها ئەوە نەبێت كە خۆت سووكو ئاسانت كردووەو تۆیش ئەگەر ویستت لە سەر بێت ئەوا خەمو پەژارە سووكو ئاسان دەكەیت.

## ٧١- الدعاء لمن عرض عليك ماله

٢٤٢- بارك الله لك في أهلك ومالك.)[2] واتە : خوا بەرەكەت برژێنێتە سەر خۆتو كەسوكارو سامانەكەتدا.

---

١ /(الصحيحة : ٢٨٨٦)

٢ /(مختصر البخاري : ٩٦٥)

## ٧٢- دعاء المقترض عند السداد
## پاڕانەوەی قەرزار لە کاتی گەڕاندنەوەی قەرزەکەیدا

٢٤٣- بارك الله لك في أهلك ومالك إنما جزاء السلف الحمد والأداء.)[١] واتە : خوا بەرەکەت بڕژێنێتە ناو کەسوکارو سامانتەوە، بە ڕاستی پاداشتی قەرزدان سوپاسکردنی خاوەن قەرزەکەیەوەو گەڕاندنەوەی قەرزەکەیە.

## ٧٣- ما يقول من قال له: إني أحبك في الله
## وەڵامی ئەو کەسەی کە پێت بڵێت: من لەبەر خوا خۆشتم دەوێت

٢٤٤- أحبك الذي أحببتني له)[٢] واتە: ئەو کەسە خۆشتی بوێت کە لە بەر ئەو خۆشمت دەوێت.

١ /( صحيح النسائي : ٤٦٩٧)

٢ /( الصحيحة : ٣٢٥٣)

٢٤٥- إذا أحب أحدكم أخاه في الله فليبين لـه، فإنه خير في الإلفة وأبقى في المودة.)[١] واتـه : ئەگەر کەسێکتان براکەی خۆی خۆش دەویست لەبەر خوا ئەوا با پێی بڵێت، چونکە ئەوە باشترە بۆ دۆستایەتییەکەیانو بەردەوام بوونی خۆشەویستییەکەیان.

## ٧٤- الدعاء لمن صنع لك معروفاً
## پاڕانەوە بۆ کەسێك چاکەی بۆ کردووی

٢٤٦- من صنع إليه معروف فقال لفاعله : جزاك الله خيراً فقد أبلغ في الثناء.)[٢] واتـه : هەرکەسێك چاکەیەکی بۆ ئەنجام داو ئەویش بە خاوەن

---

١ /( الصحيحة : ١١٩٩)

٢ /(صحيح الترغيب : ٩٦٩)

چاکەکەی وت: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە، ئەوا ئەوپەڕی سوپاسو ستایشی کردووە.

٢٤٧–عن أنس قال : قال المهاجرون : يا رسول الله ذهب الأنصار بالأجر كله ! ما رأينا قوماً أحسن بذلاً لكثير، ولا أحسن مواساة في قليل منهم، ولقد كفونا المؤنة، قال : أليس تثنون عليهم وتدعون لهم؟ قال: بلى، قال: فذاك بذلك)[١]. واتە: لە ئەنەسەوە ریوایەت کراوە دەڵێت: کۆچەران وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پشتیوانان هەموو چاکەو پاداشتیان برد! هیچ کەسێکمان نەبینیوە بە ئەندازەی ئەوان زۆر ببەخشێتو هەوڵی دابێت، کەس نییە لەوان چاکتر بێت لە بە دەمەوە هاتنو

١ /(صحيح الترغيب : ٩٧٧)

هاوکاری، ئەرکیان لە سەرمان خستووە بە دابین کردنی پێداویستییەکان، فەرمووی: ئایا ئێوە سوپاسی ئەوان ناکەنو دوعایان بۆ ناکەن؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: کەواتە ئەوە بەرانبەر ئەوە.

## ٧٥- ماذا يقول إذا مدح مسلماً

## چی دەڵێت ئەگەر باسی موسڵمانێکی بە باشی کرد

٢٤٨- إذا كان أحدكم مادحاً أخاه لا محالة فليقل : أَحْسِبُ فُلاناً كذا وكذا -إن كان يرى أنه كذلك- وحَسِيبُهُ الله، ولا أُزكِّي على الله أحداً.)[١]

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە هەر دەبوو بە چاکی باسی براکەی خۆی بکات ئەوا با بڵێت: وا بزانم کە فڵانە کەس ئا بەو شێوەیە - ئەگەر ئەو ئاکارەی

---

١ /( مختصر البخاري : ٢٣٤٨)، (مختصر مسلم: ١٥١٠)

تێدا بینی – کە خوای گەورە باشتر دەیناسیۆ و منیش هیچ کەسێك بە سەر خوای گەورەدا پاکراناگرم.

## ٧٦- ماذا يقول الرجل إذا زكي
## ئەو کەسەی کە مەدح دەکرێت چی دەڵێت

٢٤٩- اللهم لا تؤاخذني بما يقولون، واغفر لي ما لا يعلمون واجعلني خيراً مما يظنون.)[١] واتە : ئەی خودایە..ئەوەی ئەوان دەیڵێن بە تاوان لە سەرم مەینووسەو لەو تاوانانەی ئەوان نایزانن لێم خۆشبەو لەو وەسفەی ئەوان گومانم پێ دەبەن چاکترم بکە.

---

١ /( صحيح الأدب المفرد : ٥٨٥)

## ٧٧- دعاء الخوف من الشرك

## پاڕانەوەی ترسان لە هاوەڵدانان

٢٥٠- قولوا : اللهم إنا نعوذ بك من أن نشرك بك شيئاً نعلمه ونستغفرك لما لا نعلمه.)[1] واتە : بڵێن : ئەی خودایە ئێمە پەنات پێ دەگرین لەوەی کە هاوەڵت بۆ بریار بدەین بە شتێك کە دەیزانینو داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەین لەوەی کە نایزانین.

## ٧٨- ما یقال عند التعجب

## ( چی دەڵێت لە کاتی سەرسوڕماندا )

٢٥١- سبحان الله.[2] واتە : پاکیو بێگەردی بۆ خوا.

---

١ /( صحیح الترغیب : ٣٦)

٢ /( مختصر البخاري : ١٧٣)

٢٥٢– (الله أكبر.)[١] واتە : خوا لە هەموو شتێك گەورەترە.

## ٧٩- التكبير عند الأمر السار

## وتنی الله اكبر لە كاتی كارێكی خۆشدا

٢٥٣– الحمد لله، الله أكبر)[٢]. واتە : سوپاس‌و ستایش بۆ خوا، خوا لە هەموو شتێك گەورەترە.

## ٨٠- ما يقال عند الفزع

## ( چی دەڵێت لە كاتی ترسدا )

٢٥٤–(لا إله إلا الله.)[٣] واتە : هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت.

١ /( مختصر البخاري : ١١٣١)، ( ظلال الجنة : ٧٦)

٢ /(مختصر مسلم : ١٠٣)

٣ /(مختصر مسلم : ١٩٨٧)

## ٨١- الدعاء لمن سببته

## پاڕانەوە بۆ ئەو کەسانەی جوێنت پێداوە

٢٥٥-اللهم إنما أنا بشر، فأيما مسلم لعنته أو أذيته فاجعلها له زكاة ورحمة)[1] واتە : ئەی خودایە.. منیش مرۆڤم، هەر موسڵمانێك نەفرەتم لێکردووە یان ئازارم داوە ئەوا بیکە مایەی پاك بوونەوە لە تاوانو ڕەحمەت بۆی.

## ٨٢- ما يقول ويفعل من أذنب ذنباً

## (چی دەڵێتو چی دەکات کاتێ کەسێك تاوانێك ئەنجام دەدات)

٢٥٦- ما من عبد يذنب ذنبا فيتوضا فيحسن الطهور ثم يقوم فيصلي ركعتين ثم يستغفر الله لذلك

١ /.(مختصر البخاري : ٤/١٢٧)

الذنب الا غفر له)[١] واته : هەر كاتێك بەندەیەك تاوانێك لە تاوانەكان ئەنجام بداتو دەستنوێژێك بشۆرێت بە جوانیو ئەمجار هەستێ دوو ركات نوێژ بكاتو ئەمجار داوای لێخۆشبوون لە خوا بكات لەو تاوانە ئەوا خوای گەورە لێی خۆش دەبێت.

٢٥٧- من قال : أستغفر الله الذي لا إله إلا هو الحي القيوم وأتوب إليه. ثلاثاً، غفرت له ذنوبه وإن كان فاراً من الزحف.)[٢] هەركەسێك بڵێت : داوای لێخۆشبوون لەو خوایە دەكەم كە هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها ئەو نەبێت زیندوو هەڵسوڕێنەرو راگری بوونەوەرەو تەوبەی لا دەكەم.

---

١ /.(صحيح الجامع: ٥٧٣٨)

٢ /(الصحيحة:٢٧٢٧)

سـێ جـار، ئـەوا لـە تاوانـەكانی خـۆش دەبێـت هەرچەندە لـە ڕۆژی جەنگدا بەرانبـەر بـێ باوەڕان هەڵاتبێ.

## ٨٣- دعاء العطاس

## (نزای پژمین)

٢٥٨-إذا عطس أحدكم فليقل : الحمد لله وليقل لـه أخـوه أو صـاحبه : يرحمـك الله، فـإذا قـال لـه: يرحمـك الله فليقـل : يهـديكم الله ويـصلح بـالكم. وفي لفـظ (الحمـد لله علـى كـل حـال)[١]. واتـە : ئەگـەر یەكێكتان پژمی ئەوا با بڵێت : (الحمد لله) سوپاسو ستایش بۆ خوا، ئەمجار بـا براكـەی یـان هاوڕێكـەی بڵێـت : (يرحمـك الله) خـوا رەحمـەت لێبكـات، جـا

---

١ /(صحيح أبي داود :٥٠٣٣) (مختصر البخاري : ٢٣٩٢)

ئەگەر ئەو وتی : خوا رەحمەت لیٚ بکات با بلّێت : خوا رێنموییتان بکاتو کارو کردەوەتان چاك بکات) وە لە ریوایەتێکی تردا هاتووە : (سوپاسو ستایش بۆ خوا هەموو حالّێکدا)

٢٥٩- لما نفخ في آدم الروح.. فصارت في رأسه، فعطس، فقال : الحمد لله رب العالمين. فقال الله : يرحمك الله.)[١] واتە : کاتیٚ رۆح کرایە بەر ئادەمداو گەیشتە سەری، پژمی، ئادەم گوتی : سوپاسو ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان، خوای گەورە پێی فەرمو : خوا رەحمت لێبکات)

٢٦٠- إن الله يحب العطاس، يكره التثاؤب فإذا عطس أحدكم وحمد الله، كان حقاً على كل مسلم

١ /(الصحيحة :٢١٥٩)، (صحيح الجامع: ٥٢١٦)

سمعه أن يقول : يرحمك الله.)[١] واته : خوای گەورە پـژمینی پێخۆشـەو رقـی لـە باوێـشکە، جـا ئەگـەر یـەکێکتان پـژمیو سوپاسو ستایـشی خـوای کـرد ئـەوا حـەقی لـە سـەر هـەموو موسـڵمانێك هەیـە گوێبیستی بێت بڵێت : خوا ڕەحمت لێبکات)

قال الشيخ – رحمه الله–: وقوله: كان حقاً على كل مسلم سمعه، دليل واضح على وجوب التشميت على كل من سمعه، وما اشتهر أنه فرض كفائي إذا قام به البعض سقط عن الباقين، مما لا دليل عليه هنا، بخلاف رد السلام.اهـ)[٢] واته: شێخ دەڵێت: ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە دەڵێت (ئـەوا

---

١ /(مختصر البخاري: ٢٣٩٤)

٢ /(تحقيق الكلم الطيب: ١٥٨)

حەقی لە سەر هەموو موسڵمانێك هەیە گوێبیستی بێت) بەڵگەیەكی روون وئاشكرایە بە واجب بوونی وەڵام دانەوەی هەركەسێك گوێبیستی بێت، ئەوەی كە بڵاو بووەتەوە لە ناو خەڵكیدا كە وەڵامدانەوەی (فرض كفایة)یە ئەگەر هەندێ كەس بەو كارە هەستان ئەوا لە سەر شانی ئەوانیتر دەكەوێت، ئەوە قسەیەكە كە هیچ بەڵگەیەكی لێرەدا نییە، بە جیاواز لە گەڵ وەڵامدانەوەی سەلامدا).

## ٨٤- ما يقال للكافر إذا عطس

## (بە بێباوەڕ چی دەگوترێت ئەگەر پژمی)

٢٦١- يهديكم الله ويصلح بالكم.)[١] واتە : خوا رێنموییتان بكات و كارو كردەوەتان چاك بكات).

---

١ /(صحيح أبي داود: ٥٠٢٧)

## ٨٥- الذكر في المجلس

## (زیكر له مه‌جلیسدا)

٢٦٢- رب اغفر لي وتب علي انك انت التواب الغفور. مائة مرة.) واته : په‌روه‌ردگارا.. له تاوانه‌كانم خۆشبه‌و ته‌وبه‌م لێ قبول بكه، تۆ ته‌وبه‌وه‌رگرو لێبورده‌ی) سه‌د جار

٢٦٣- اللهم اقسم لنا من خشيتك ما تحول به بيننا وبين معاصيك، ومن طاعتك ما تُبلِّغنا به جنَّتك، ومن اليقين ما تهوِّن به علينا مصائب الدنيا، اللهم متِّعنا بأسماعنا، وأبصارنا، وقوَّاتنا ما أحييتنا، واجعله الوارث منا، واجعل ثأرنا على من ظلمنا، وانصرنا على من عادانا، ولا تجعل مصيبتنا في ديننا، ولا تجعل الدنيا أكبر همِّنا، ولا مبلغ علمنا،

ولا تسلّط علينا من لا يرحمنا.)[١] واتە: ئەی خودایە..
لە ترسی خۆت ئەوەندەمان بەسەردا دابەش بکە
دوورمان بخاتەوە لە سەرپێچی کردنت، وە لە
گوێڕایەڵی خۆت ئەوەندەمان پێ ببەخشە
بمانگەیەنێتە بەهەشتو لە دڵنیایی ئەوەندەمان پێ
ببەخشە کە بەڵاو موسیبەتەکانی دونیامان لا
سووكو ئاسان بکاتەوە، ئەی خودایە..
ئاسوودەمان بکە بە بیستنو بینینو هێزەکانمان تا
دەمانژێینیو لە پاش خۆمان بە میرات بە جێی
بهێڵە بۆ نەوەکانمان وە رقو تووڕەییمان روو پێ
بکەرە ئەو کەسەی ستەمی لێکردووینو سەرمان
بخە بەسەر ئەوانەی دوژمنایەتیمان دەکەن وە

١ /(صحيح الترمذي : ٣٥٠٢)

بەڵاو موسیبەتمان مەخەرە دینەکەمانەوەو دونیا مەکە بە گەورەترین خەم وخەفەتمانو مەیکەرە ئەوپەڕی زانستمانو کەسێك دەسەڵاتدار مەکە بە سەرماندا بەزەیی نەیەتەوە پێماندا.

## ٨٦- دعاء كفارة المسجد

٢٦٤–سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت ، أستغفرك و أتوب إليك، إلا كفر الله له ما كان في مجلسه ذلك)[١] واتە : پاکیو بێگەردیو سوپاس بۆ خوایە، شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها تۆ نەبێت، داوای لێخۆشبوونت لێدەکەمو دەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ.

١ /(صحيح الكلم:١٧٧/١٧٨)

ئیللا خوای گەورە لە تاوانەکانی ئەو مەجلیسەی خۆش دەبێت.

٢٦٥- سبحان الله وبحمده، سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك، فقالها في مجلس ذكر كانت كالطابع يطبع عليه، ومن قالها في مجلس لغو، كانت كفارة له)[١].

واتە :پاکیو بێگەردیو سوپاس بۆ خوا، پاکیو بێگەردیو سوپاس بۆ خوایە، شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها تۆ نەبێت، داوای لێخۆشبوونت لێدەکەمو دەگەرێمەوە بۆ لای تۆ. ئەگەر لە مەجلیسێکی زیکردا وتی ئەوا هەروەکو مۆرێك وایە لێی دەدرێت، وە هەرکەسێك

---

١ /(الصحيحة : ٨١)

لـە مەجلـسێکی لـەغودا وتــی ئـەوا دەبێتــە هــۆی کەفارەتـی.

٢٦٦- كان الرجلان من أصـحاب الـنبي (ﷺ) إذا التقيـا لم يتفرقـا حتـى يقـرأ أحـدهما علـى الآخـر: ﴿والعصر إن الإنسان لفي خسر﴾ ثم يـسلم أحـدهما علـى الآخـر.)[1] واتـە: ئەگـەر دوو پیـاو لـە هـاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە یەك بگەیـشتایەن ئـەوا لـە یەك جودا نەدەبوونەوە تـاوەکو یـەکێکان سورەتی ﴿والعــصر إن الإنــسان لفــي خــسر﴾ بــە ســەر ئەویتریانـدا نەخوێندایەتـەوە ئـەمجار سـڵاویان لـە یەکتر دەکرد.

---

١ /(الصحيحة : ٢٦٤٨)

## ٨٧- الدعاء لذهاب الغضب

## ( پارانەوە بۆ نەهێشتن و نەمانی پەستی و توڕەیی )

٢٦٧- أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)[1] واتە : پەنا بە خوا دەگرم لە شەیتانی نەفرەت لێکراو.

٢٦٨- عن عائشة قالت: أهديت لرسول الله شاة، قال: (اقسميها) فكانت عائشة إذا رجع الخادم تقول: ما قالوا ؟ يقول الخادم :قالوا: بارك الله فيكم، فتقول عائشة: وفيهم بارك الله، نرد عليهم مثل ما قالوا، ويبقى أجرنا لنا.)[2] واتە: لە عائیشەوە ریوایەت کراوە کەوا فەرموویەتی: مەڕێك بە دیاری درا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەویش فەرمووی:

---

١ /(صحيح الكلم : ١٨١)

٢ /(صحيح الكلم : ١٨٥)

دابەشی بکە، جا ئەگەر خزمەتکارەکە بگەڕایەتەوە عائیشە دەیفەرموو: چییان گوت ؟ خزمەتکارەکە دەیگوت: خوا بەرەکەت بخاتە ماڵتانەوە، عائیشە دەیفەرموو: خوا بەرەکەت بخاتە ماڵی خۆیانەوە ئەوەی کە فەرموویانە بۆیان دەگەڕێنینەوەو پاداشتەکەمان بۆ دەمێنێتەوە.

## ٨٩- الدعاء عند رؤية باكورة الثمر
## پاڕانەوەی کاتی بینینی سەرەتاو ئەوەڵی بەرووبووم

٢٦٩- اللهم بارك لنا في ثمرنا، وبارك لنا في مدينتنا، وبارك لنا في صاعنا، وبارك لنا في مدنا. ثم يعطيه أصغر من يحضر من الولدان.)[١] واتە: ئەی

---

١ /(صحيح الكلم : ١٨٦)

خودایە.. بەرەکەت بڕژێنە بە سەر میوەکەمانەوەو بەرەکەت بڕژێنە بە سەر شارەکەمانەوە، وە بەرەکەت بخەرە دەفرمانەوە (صاع)و بەرەکەت بخەرە مشتمانەوە. ئەمجار دەیداتە بچوکترین منداڵ کە ئامادەیە.

## ٩٠-دعاء شراء الدابة أو السيارة

## پاڕانەوەی کاتی کڕینی وڵاخێك یان ئۆتۆمبیلێك

٢٧٠- فليأخذ بناصيتها وليسم الله – عز وجل- وليدع بالبركة وليقل : اللهم إني أسألك من خيرها وخير ما جبلتها عليه وأعوذ بك من شرها وشر ما جبلتها عليه.)[1] واتە : با ناوچاوانی بگرێتو ناوی خوا بهێنێتو دوعای بەرەکەتی بۆ بکاتو بڵێت :

١ / (آداب الزفاف : ٩٢)

ئـەی خودایـە مـن داوای خـەیرو چـاکەکەیت لـێ دەکەمو خەیرو چاکەی ئەو تەبیعەتو سروشتەی تێیدا چاندوتەو پەنات پێ دەگرم لە خراپەیو خراپەی ئەو تەبیعەتو سروشتەی تێیدا چاندوتە.

## ٩١- التسمية على الطعام

## ناوی خوا هێنان لە کاتی نانخواردندا

٢٧١- بسم الله.)[١] واتە: بە ناوی خوا

قال الشيخ – رحمه الله-: وفي الحديث أن التسمية في أول الطعام بلفظ (بسم الله)، لا زيادة فيها، وكل الأحاديث الصحيحة التي وردت في الباب ليس فيها الزيادة، ولا أعلمها وردت في حديث، فهي بدعة عند الفقهاء بمعنى البدعة. ا هـ[٢]. واتە: شەیخ

---

١ /(صحيح الكلم : ١٤٩)

٢ /(الصحيحة : ٧١)

(رەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: لە فەرموودەکەدا هاتووە کە ناوی خوا هێنان لە سەرەتای نانخواردندا دەبێت بە وتنی (بسم الله) بە بێ هیچ زیادەیەك، وە هەموو فەرموودەیەکی صەحیح لەم بارەیەوە هاتووە هیچ زیادەیەکی تێدا نییە، وە نازانم لە هیچ فەرموودەیەکدا هاتبێت، ئەوەش لای زانایان بیدعەیە بە مانای بیدعە.

## ٩٢- من نسي أن يذكر الله في أول طعامه

## هەرکەسێك لە بیری چوو لە سەرەتای نانخواردندا ناوی خوا بهێنێ

٢٧٢- إذا أكل أحدكم فليذكر اسم الله تعالى في أوله ، فإن نسي أن يذكر الله تعالى في أولهِ فليقلْ: بسم الله في أوله و أخره(فإنه يستقبل طعاماً جديداً، ويمنع الخبيث ما كان يصيب منه.)[1] واتە :ئەگەر

---

١ /(صحيح أبي داود:٣٧٦٧)،(صحيح الكلم: ١٤٤)

یەکێکتان دەستی بە خواردن کرد ئەوا با ناوی خوای گەورە لە سەرەتاوە بهێنێت، جا ئەگەر ناوی خوای لە سەرەتاوە لە بیر چوو ئەوا با بڵێت : بە ناوی خوای گەورە لە سەرەتاو کۆتاییدا (جا ئەوە ڕوودەکاتە خواردنێکی نوێو خراپەی ئەوەی کە توشی دەبێت لێی دوور دەکاتەوە.

## ٩٣- التسمية على الطعام الذي لا يدري أذكر عليه اسم الله أم لا

## ناوی خوا هێنان لە سەر خواردنێك نازانێت ئایا ناوی خوای هێناوە یان نا

٢٧٣- سموا أنتم وكلوا.)[١] واتە : ئێوە ناوی خوا بهێننو ئەمجار بخۆن.

١ /(صحيح ابن ماجه : ٣٢٣٤)

## ٩٤- الدعاء بعد الطعام

## پاڕانەوەی پاش خواردن

٢٧٤- من أكل طعاماً فقال : الحمد لله الذي أطعمني هذا ، و رزقنيه من غير حول مني ولا قوةٍ، غفر له ما تقدم من ذنبه)[1] واته : هەرکەسێك خواردنێکی خواردو ئەمجار وتی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەم خواردنەی دامیٚو رزق و رۆزی دام بە بیٚ هێزو توانای خۆم، ئەوا لە هەموو تاوانەکانی پێشی خۆش دەوێت.

٢٧٥- اللهم اطعمت واسقيت و اغنيت و اقنيت وهديت واحييت فلك الحمد على ما اعطيت.)[2] واته:

---

١ / (صحيح أبي داود : ٤٠٢٣)

٢ /(صحيح الكلم : ١٤٩)

ئەی خودایە هەر تۆ خواردنو خواردنەوەت داوەو دەوڵەمەندت کردووین وهەموو شتێکی ترت بەخشیوەو هیدایەتت داوەو ژیاندووتە، سا سوپاس وستایش بۆ تۆیە لەسەر ئەوەی کە بەخشیوتە.

٢٧٦- الحمد لله كثيراً طيباً مباركاً فيه، الحمد لله الذي كفانا وأروانا غير مَكْفي و لا مكفور. وقال مرة : لك الحمدُ ربنا غيْرَ مَكْفيّ، ولا مُوَدَّع، ولا مُستَغنَى عَنْهُ ربّنا.)[1] واتە: سوپاسو ستایش بۆ خوا سوپاسو ستایشێکی زۆرو پیرۆزو پاکو پڕ بەرەکەت، سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ناچاری دەستی هیچ کەسێکی نەکردینو تەنها خۆی بەسمانە، تینوێتی شکاندووین بە بێ ڕەتکردنەوەو نکۆڵی لێکردن، وە جارێکیان

١ / ( مختصر البخاري : ٢١٥٧)، (صحيح أبي داود : ٣٨٤٩)

فـەرمووی: پـەروەردگارمان سـوپاس‌و سـتایش بـۆ تۆیـە بـە بـێ نکۆڵی لێکـردن‌و بـە بـێ وازلێهێنـان‌و دەستلێهەڵگرتن لە پەروەردگارمان.

٢٧٧- الحمد لله الذي اطعم وسقى وسوغه وجعل لـه مخرجـا.)[1] واتـە : سـوپاس‌و سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی کـە خـواردنی دایـنیّ‌و تێرئـاوی کـردین‌و (چوونەژوورەوەو) دابەزانـدنی خواردنەکـەی ئاسـان کردوەو دەرچەی بۆ داناوە.

**٩٥- ما يقول إذا شرب اللبن**

**چی دەڵێت ئەگەر شیرو دۆی خوارد**

٢٧٨- اللهم بارك لنا فيه وزدنا منه)[2] واتە: ئەی خودایـە.. بەرەکـەت بڕژێنـە بـە سـەرمانداو لـەم خواردنە زیاترمان بدەرێ.

---

١ /(صحيح أبي داود : ٣٨٥١)، ( الصحيحة: ٢٠٦١)

٢ /(صحيح أبي داود : ٣٧٣٠)

## ٩٦- التسمية عند الشراب

## ناوی خوا هێنان لە كاتی خواردنەوەدا

٢٧٩- كان (ﷺ) يشرب في ثلاثة أنفاس، إذا أدنى الإناء إلى فمه سمى الله تعالى، وإذا أخرّه حمد الله تعالى، يفعل ذلك ثلاث مرات)[١] واتە : پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە سێ هەناسە خواردنەوەی دەخوادەوە، جا ئەگەر قاپەكەی لە دەمی خۆی نزیك بكردایەتەوە ئەوا ناوی خوای دەهێناو ئەگەر لێی دوور بكردایەتەوە سوپاسی خوای دەكرد، ئەم كارەی سێ جار دووبارە دەكردەوە.

---

١ /( الصحيحة : ١٢٧٧)

## ٩٧- دعاء الضيف لأهل الطعام

## پاڕانەوەی میوان بۆ خاوەن ماڵ

٢٨٠- اللهُمَّ بَارِكْ لَهُم فيما رَزَقتهُمْ، واغْفِر لهم وارحَمْهُم.)[١] واتە : ئەی خودایە.. بەرەکەت بڕژێنە بە سەر ئەو ڕۆزییەی داوتنەتیو لێیان خۆشبەو بەزەییت پێیاندا بێتەوە.

٢٨١- اللهُمَّ أطْعِمْ مَنْ أطْعَمَني وأسْقِ مَنْ سَقَاني.)[٢] واتە : ئەی خودایە.. ئەو کەسەی خواردنی پێدام تۆیش خواردنی بدەیو ئەو کەسەی تێرئاوی کردین تۆیش تێر ئاوی بکە.

---

١ /( مختصر مسلم : ١٣١٦) (صحيح أبي داود : ٣٧٢٩)

٢ /(مختصر مسلم : ١٥٣٥)

## ٩٨- دعاء الصائم عند فطره

## پاڕانەوەی ڕۆژووان لە کاتی ڕۆژووشکاندندا

٢٨٢- ذَهبَ الظّمأُ، وابتلّت العروقُ وثَبَتَ الأجرُ إنْ شاء الله)[1] واتە : تینوێتی ڕۆیشتو دەمارەکان ڕەوینەوەو پاداشتەکەمان جێگیرو مسەوگەر بوو بە ویستی خوای گەورە.

## ٩٩- الدعاء لمن أفطر عنده

## پاڕانەوە بۆ ئەو کەسەی بەربانگی لادەکاتەوە

٢٨٣- أفطَر عِندَكم الصائِمونَ وأكل طعامَكُمُ الأبْرارُ، وصلت، وفي رواية وتنزَّلت عليكُمُ الملائِكَةُ)[2] واتە : یاخوا ڕۆژووانان لاتان بەربانگ بکاتەوەو

---

١ /(صحيح أبي داود : ٢٣٥٧)

٢ /(صحيح الجامع : ٤٦٧٧/٤٦٧٩)

پیاوچاکان خواردنەکەتان بخۆن‌و فریشتەش داوای لێخۆشبوونتان بۆ بکەن – لە ریوایەتێکی تردا هاتووە – فریشتەش دابەزێتە سەرتان.

قال الشيخ – رحمه الله– : واعلم أن هذا الذكر ليس مقيداً بعد إفطاره، بل هو مطلق، وقوله : (أفطر عندكم الصائمون) ليس هو إخباراً، بل دعاء لصاحب الطعام بالتوفيق حتى يفطر الصائمون عنده.. وليس في الحديث التصريح بأنه (ﷺ) كان صائماً فلا يجوز تخصيصه بالصائم. ا هـ)[1] واتە: شەیخ (رەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ئەوەش بزانە ئەم دوعایە تایبەت نییە بە پاش بەربانگ کردنەوە بەڵکو ئەمە رەهایە، (رۆژووانان لاتان بەربانگ بکەنەوە) رستەیەکی هەواڵی نییە

---

١ /(آداب الزفاف : ١٧٠/١٧١)

بەڵکو ڕستەیەکی پاڕانەوەیە بۆ خاوەن خوانەکە تاوەکو ڕۆژووانان بەریانگ بکەنەوە لای ئەو، لە فەرموودەکەدا نەهاتووە کەوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە ڕۆژوو بووە بۆیە دروست نییە تایبەت بکرێت بە ڕۆژووانەوە.

**١٠٠ – ما يقول من حضر الطعام وهو صائم إذا لم يفطر**

**کەسی ڕۆژووان چی دەڵێت ئەگەر خواردن ئامادە بووو ڕۆژووەکەی نەشکاند**

٢٨٤– إذا دعي أحدكم فليجب، فإن كان مفطراً فليطعم، وإن كان صائماً فليصل) يعني الدعاء)[١].

واتە : ئەگەر یەکێکتان بانگ کرا بۆ دەعەوەتییەك ئەوا با وەڵامی بداتەوەو بچێت، جا ئەگەر بە ڕۆژوو نەبوو ئەوا با بخواتو ئەگەر بە ڕۆژوو بوو ئەوا با بۆیان بپاڕێتەوە.

---

١ /(صحيح أبي داود : ٢٤٦)

## ١٠١- دعاء من نزل به ضيف
## پاڕانەوەی کەسێك میوانی هاتبێت

٢٨٥- اللهم إني أسألك من فضلك ورحمتك، فإنه لا يملكها إلا أنت)[١] واتە : ئەی خودایە.. من داوای فەزڵو رەحمەتی تۆ دەکەم، چونکە هیچ کەسێك خاوەنی نییە تەنها تۆ نەبێت.

## ١٠٢- ما يقول الصائم إذا سابه أحد
## رۆژوان چی دەڵێت ئەگەر کەسێك جوێنی پێدا

٢٨٦- وإذا كان يوم صوم أحدكم، فلا يرفث، ولا يصخب، ولا يجهل، فإن سابه أحد أو قاتله، فليقل : إني امرؤ صائم مرتين.)[٢] واتە : ئەگەر

---

١ /(الصحيحة : ١٥٤٣)

٢ /( مختصر البخاري : ٨٨٧)

ڕۆژی ڕۆژووی کەسێکتان بوو ئەوا با قسەی هیچو پووچ نەکاتو دەنگی بەرز نەکاتەوەو کەس توڕە نەکاتو هیچ کارێکی نەفامانە نەکاتو ئەگەر کەسێك جوێنی پێدا یان لە گەڵیدا جەنگا ئەوا با بڵێت : من بە ڕۆژووم.. من بە ڕۆژووم).

## ١٠٣- الدعاء للمتزوج

## دوعا بۆ ئەو کەسەی ژنی هێناوە

٢٨٧- بارك الله لك، وبارك عليك وجمع بينكما في – وفي رواية على – الخير)[١] واتە : خوا بەرەکەت بخاتە ژن هێنانەکەتەوەو بەرەکەت برژێنێت بە سەر خۆتداو لەسەر خەیرو چاکە کۆتان بکاتەوە.

---

١ /(آداب الزفاف : ١٧٥)

٢٨٨- بـارك الله لـك)[١] واتــه : خـوا بەرەكـەت بڕێژێ بە سەرتدا.

٢٨٩- اللهم بارك فيهما، وبارك لهما في بنائهمـا)[٢] واته : ئەی خودایە.. بەرەكەت بڕێژە بە سـەریانداو بەرەكــەت بخــەرە دامەزراندنیانــەوە لــە پــاش گواستنەوە.

٢٩٠- علـى الخـير والبركـة، وعلـى خـير طـائر.)[٣] واتە : لە سەر چاكەو بەرەكەتو لە سەر نـسیبێكی چاك كۆی كردبێتنەوە.

١ /(آداب الزفاف : ١٤٩-١٧٢)

٢ /(آداب الزفاف : ١٧٤)

٣ /(آداب الزفاف : ١٧٤)

## ١٠٤- دعاء المتزوج إذا دخل على زوجته ليلة العرس

## پاڕانه‌وه‌ی زاوا ئه‌گه‌ر له‌ یه‌که‌م شه‌ودا چووه‌ ژووره‌وه‌ بۆ لای خێزانه‌که‌ی

٢٩١- إذا تزوج أحدكم امرأة فليأخذ بناصيتها، وليسم الله -عز وجل- وليدع بالبركة، وليقل : اللهم إني أسألك من خيرها وخير ما جبلتها عليه، واعوذ بك من شرها وشر ما جبلتها عليه.)[١] واته : ئه‌گه‌ر یه‌کێك له‌ ئێوه‌ ژنی هێنا ئه‌وا با ناوچاوانی بگرێت‌و ناوی خوا بهێنێت‌و دوعای به‌ره‌که‌تی بۆ بکات‌و بڵێت : ئه‌ی خودایه‌ من داوای خه‌یرو چاکه‌که‌یت لێ ده‌که‌م‌و خه‌یرو چاکه‌ی ئه‌وه‌ ته‌بیعه‌ت‌و سروشته‌ی

١ /(آداب الزفاف : ٩٢)

تێیدا چاندوتەو پەنات پێ دەگرم لە خراپەیو خراپەی ئەو تەبیعەتو سروشتەی تێیدا چاندوتە.

٢٩٢- وعن نفر من أصحاب النبي (ﷺ) وفيهم ابن مسعود وأبو ذر وحذيفة فقالوا :إذا دخل عليك أهلك فصل ركعتين، ثم سل الله من خير ما دخل عليك، وتعوذ به من شره، ثم شانك وشان أهلك.)[١]

واتە : لە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە (ابن مسعودو أبو ذر و حذيفة) تێدابووە ریوایەت کراوەو دەڵێن : ئەگەر چویتە ژوورەوە بۆ لای خێزانەکەت ئەوا دوو رکات نوێژ بکە(نوێژی ژن گواستنەوە)و ئەمجار داوای خەیرو چاکەی ئەوەی بۆت هاتووە بکەو پەنا بگرە لە

١ /(آداب الزفاف : ٩٤)

خراپەی، پاش ئەوە خۆتو خێزانەکەت کاری خـەیر ئەنجان بدەن.

٢٩٣- وقال ابن مسعود : قل : اللهم بـارك لـي في أهلي، وبـارك لهـم في، اللـهم اجمـع بيننـا مـا جمعـت بخـير وفـرق بيننـا إذا فرقـت إلى الخـير)[1] واتـە: ابـن مسعود فەرموویەتی: بڵێ: ئەی خودایە.. بەرەکەت برێـژە بـە سـەرمدا لـە خێزانەکەمـەوەو بەرەکـەت برێژە بە سەر ئەواندا لـە منـەوە، ئـەی خودایـە.. کۆمان بکەرەوە ئەوەنـدەی کۆبوونـەوەمان خـەیری تێدایە بۆمانو جیامان بکەرەوە لە یەکتر ئەگـەر لـە جیابونەوەماندا خەیر هەیە.

---

١ / (آداب الزفاف : ٩٥)

## ١٠٥- الدعاء قبل الجماع

## پاڕانەوەی پێش جووت بوون لە گەڵ خێزاندا

٢٩٤- لو أن أحدكم يقول حين يأتي أهله : بسم الله اللهم جنبني الشيطان، وجنب الشيطان ما رزقتنا، ثم قدر بينهما في ذلك ولد لم يضره الشيطان أبداً ولم يسلط عليه)[١] واتە : ئەگەر یەکێکتان کاتێ دەچێتە لای خێزانەکەیەوەو بڵێت :((بە ناوی خوا.. ئەی خودایە.. شەیتانمان لێ دوور بکەرەوەو شەیتان دوور بکەرەوە لەوەی کە پێمان دەبەخشی)) ئەگەر تەقدیری خوا وابوو منداڵێك ببێت، ئەوا شەیتان هەرگیز زیانی پێ ناگەیەنێتو دەسەڵاتی بە سەردا نابێت.

---

١ /( مختصر البخاري : ٢٠٧٣)

## ١٠٦-الدعاء للمولود عند تحنيكه

## دوعاکردن بۆ منداڵی کۆرپە لە کاتی شیرینیدان بە مەڵاشویدا

٢٩٥- كان (ﷺ) يؤتى بالصبيان فيدعو لهم بالبركة ويحنكهم.)[1] واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) منداڵیان بۆ دەهێنا- منداڵی تازە لە دایك بوو (کۆرپە) – ئەویش دوعای بەرەکەتی بۆ دەکردنو شیرینی(خورما)ی دەدا بە ئاسمانەی دەمیاندا (مەڵاشوویاندا).

---

١ /(صحيح الكلم : ١٦٩)

## ١٠٧- الدعاء بعد التسليم للقضاء من غير عجز ولا تفريط

## پاڕانەوە لە پاش تەسلیم بوون بەرانبەر خواستو بڕیاری خوایی بە بێ نەتوانکاریو کەمتەرخەمی

٢٩٦- المؤمن القوي خير وأحب إلى الله تعالى من المؤمن الضعيف، وفي كل خير احرص على ما ينفعك، واستعن بالله -عز وجل - ولا تعجز، وإن أصابك شئ فلا تقل : لو أني فعلت كان كذا و كذا ولكن قل : قدر الله وما شاء فعل، فإن لو تفتح عمل الشيطان)[1] واتە : ئیمانداری بەهێز باشترو خۆشەویسترە لای خوای گەورە لە ئیمانداری بێهێز، وە لە هەموویدا خەیرو چاکە هەیە، سووربە

---

١ /(مسلم:١٨٤)

لەسەر ئـەوەی سـوودی بۆت هەیـەو پـەنا بـە خـوا بگـرەو تەمبـەڵو تـەوەزەل مەبـەو ئەگـەر شـتێکت تـووش هـات ئـەوا مـەڵێ: ئەگـەر ئـەوەو ئـەوەم بکردبایە، بەڵکو بڵێ: خوای گـەورە ئـەوەی ویـستی لێبووو تەقدیری بوو کـردی، چـونکە وشـەی ئەگـەر (لو) دەرگاو کارەکانی شەیتان دەکاتەوە.

## ١٠٨- الحمد لله لمن جاءه أمر يسره أو يكرهه

## سوپاسی خواکردن ئەگەر کەسێك هەواڵی خۆش یان ناخۆشی پێ گەیشت

٢٩٧–الحمد لله الذي بنعمته تـتم الـصالحات " و إذا رأى مـا يكـره قـال:" الحمـد لله علـى كـل حالِ.)[١]واتە: سوپاسو ستایش بۆ ئـەو خوایـەی کـە

---

١ / (الصحيحة : ٢٦٥)

بە نیعمەتەکانی ئەو چاکەکان کۆتایی پێ دێت، وە ئەگەر شتێکی بینی کە پێی ناخۆش بوو دەڵێت: سوپاس‌و ستایش بۆ خوا لە هەموو کات‌و ساتێکدا (تەنگانەو خۆشی).

٢٩٨- کان (ﷺ) إذا جاءه أمر سرور أو بشر به خر ساجداً شكراً لله.)[١] واتە : ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) کارێکی خۆش رووی بدایە یان مژدەیەکی خۆشیان پێ بدایە ئەوا یەکسەر بە سوژدە سوپاسی خوای دەکرد)

١ /(صحیح أبي داود : ٢٧٧٤)

## ١٠٩- ما يقال عند الكرب
## چی دەگوترێت لە کاتی خەمو خەفەت

٢٩٩-لا إلـه إلا الله العظـيم الحلـيم، لا إلـه إلا الله رب العـرش العظـيم، لا إلـه إلا الله رب الـسموات ورب الأرض ورب العـرش الكـريم.)[١] واتـە : هـيچ خوايـەك نييە شايستەی پەرستن بێـت تـەنها خـوای مـەزنو خـاوەن حـيلمو خـۆگر نـەبێت، هـيچ خوايـەك نييـە شايستەی پەرستن بێت تەنها خـوای پـەروەردگاری عەرشی مەزن نەبێـت، هيچ خوايەك نييە شايستەی پەرسـتن بێـت تـەنها خـوای پـەروەردگاری ئاسمانـەكانو پـەروەردگاری زەویو پـەروەردگاری عەرشی بەڕێز نەبێت.

---

١ /(مختصر البخاري : ٢٤٣٤)

٣٠٠- اللهم رحمتك أرجو فلا تكلني إلى نفسي طرفة عين وأصلح لي شأني كله لا إله إلا أنت)[١].
واته : ئەی خودایە..تکات لێ دەکەم بەزەییت بە مندا بێتەوە، بۆیە تەنانەت بۆ چاوترووکانێکیش مەمدەرە دەستی نەفسەکەی خۆمەوەو هەموو کارەکانم بۆ چاك بکە، هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ.)

٣٠١-لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين)[٢]. واته : هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها تۆنەبێت، پاکیو بێگەردی بۆ تۆ من یەکێك بووم لە ستەمکاران.

---

١ / (صحيح أبي داود : ٥٠٩٠)

٢ /(الصحيحة : ١٧٤٦)

٣٠٢- یا حي یا قیوم برحمتك استغیث.)[١] واتە : ئەی زیندوو، ئەی ڕاگرو هەڵسوڕێنەری بوونەوەر، بە بەزەیت داوای فریاکەوتنت لێ دەکەم)

٣٠٣- لا إله إلا الله الحلیم الكریم ، لا إله إلا الله العلي العظیم ، لا إله إلا الله رب السماوات السبع،رب العرش العظیم)[٢].واتە : هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها خودای خاوەن حیلمو خۆگرو بەڕێز نەبێت, هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها خودای بەرزو مەزن نەبێت، هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکانو پەروەردگاری عەرشی گەورەو مەزن نەبێت)

---

١ /(صحیح الترمذي : ٣٥٢٥)

٢ /(الصحیحة:٢٩١٦)

٣٠٤- لا إلـه إلا الله الحليم الكريم ، سبحانه و تبارك رب العرش العظيم ، والحمد لله رب العالمين.)[١]. واتە : هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها خودای خاوەن حیلمو خۆگرو بەڕێز نەبێت، پاکیو بێگەردی بۆ ئەوو بەرز وپیرۆز بێت پەروەردگاری عەرشی مەزنو سوپاسو ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان).

## ١١٠-ما يقال عند الهم والحزن

## چی دەڵێت لە کاتی خەمو پەژارەدا

٣٠٥- ما أصاب عبداً هم ولا حزن فقال : اللهم إني عبدك وابن عبدك، وابن أمتك، ناصيتي بيدك، ماضٍ فيَّ حكمك، عدلٌ فيَّ قضاؤك. أسألك بكلِّ اسم

١ /( صحيح الموارد :٢٣٧١)

هـو لـك سمَّيـت بـه نفسك، أو أنزلته في كتابـك، أو علَّمته أحداً من خلقك، أو استأثرت به في علم الغيب عندك، أن تجعل القرآن ربيـع قلبي، ونور صدري، وجلاء حُزني، وذهاب همي. إلا أذهب الله همه وحزنه وأبدلـه مكانـه فرجـاً)[1] واتـه : هـەرکاتێ بەندەیـەك توشی خەمو پەژارەیەك هاتو گوتی : ئەی خودایـە مـن بەنـدەی تـۆمو کـوڕی بەنـدەی تـۆمو کـوڕی کۆیلەی تۆم، ناوچـاوانم بـە دەسـتی تۆیـە، فرمـانو بڕیـارت بـە سـەرمدا جـێ بـە جێیـە، بڕیاردانـت بـە سەرمدا دادپەروەرانەیـە. داوات لێـدەکم بـە هـەموو ناوەکان کە هی تۆیە، خۆتت پێی ناونـاوە، یـان لـە کتێبەکەتـدا دادبەزانـدووە یـان یـەکێك لـە دروسـت

---

[1] /(صحيح الكلم : ١٢٤)،(تراجع العلامة : ٥١)

کراوەکانی خۆتت فێر کردووە یان لە عیلمی غەیبدا لای خۆت هێشتوەتەوە، قورئانی پیرۆز بکەرە بەهاری دڵەکەمو روناکی سینەمو نەهێشتنی خەمو پەژارەم. ئەوا ئیللا خوای گەورە خەمو پەژارەکەی لە سەر لادەداو بۆی دەگۆڕێتە دڵخۆشیو ئاسوودەیی.

٣٠٦- اللهم إني أعوذ بك من الهم والحزن والعجز والكسل والجبن والبخل وضلع الدين و غلبة الرجال)[١] واتە : ئەی خودایە من پەنات پێ دەگرم لە خەمو پەژارەو بێهێزیو پەککەوتنو تەمبەڵیو ترسنۆکیو رەزیلیو بوون بە ژێر باری قەرزەوەو زاڵبوونی دوژمنان.

١ /(مختصر البخاري:١٢٣٤)

## ١١١- ما يقال من خاف قوماً أو غيرهم
## چی دەڵێت ئەگەر لە کۆمەڵێك ترسا

٣٠٧- اللهم إنا نجعلك في نحورهم، ونعوذ بك من شرورهم)[١] واتە : ئەی خودایە ئێمە تۆ دەکەین بە گژ ئەواندا و پەنا دەگرین بە تۆ لە خراپەیان.

٣٠٨- اللهم اكفنيهم بما شئت)[٢] واتە: ئەی خودایە.. بەوەی کە خۆت ویستت لە سەرییەتی ئەوانمان لە کۆڵ بکەرەوە.

٣٠٩- قال عبدالله بن عباس: (حسبنا الله ونعم الوكيل) قالها ابراهيم حين ألقي في النار وقالها محمد(ﷺ) حين قال له الناس: (إن الناس قد جمعوا

١ /(صحيح أبي داود: ١٥٣٧)

٢ /(مختصر مسلم : ٢٠٩٣)

لكم)[١] واتە: عبدالله ی كوڕی عەباس دەڵێت : (خودای گەورەمان بەسەو هەر ئەویش باشترین كەسە پشتی پێ ببەستی) ئەم وتەیە ئیبراهیم فەرمووی كاتێك هاویشتیانە ناو ئاگرەوەو موحەممەد فەرمووی كاتێ خەڵكی پێی گوت: (إن الناس قد جمعوا لكم).

٣١٠- اللهم استر عوراتنا، وآمن روعاتنا، قال: فضرب الله وجوه أعدائه بالريح فهزمهم الله)[٢] واتە: ئەی خودایە.. عەیبەكانمان بشارەوەو ترسەكانمان مەهێڵەو بیگۆڕە بە ئاسایشی، دەڵێت: خوای گەورە بە بایەك دای بە ناوچاوان دوژمنانیداو خوای گەورە شكستی پێ هێنان)

---

١ /(مختصر البخاري : ١٨٧٧)

٢ /(الصحيحة : ٢٠١٨)

## ١١٢- الدعاء لطرد الشيطان
## پاڕانەوە بۆ دوورخستنەوەی شەیتان

الاستعاذة : (پەناگرتن)

٣١١- تعوذا بالله من الشيطان الرجيم, من همزه ونفخه ونفثه. قالوا : يا رسول الله وما همزه ونفخه ونفثه؟ قال: ((أما همزه فهذه الموتة، التي تأخذ بني آدم, وأما نفخه فالكبر, وأما نفثه فالشعر)[١] واتە : پەنا بگرن بە خوا (هەردوکتان) لە شەیتانی نەفرین لێکراو، لە وەسوەسەو شێتیو شیعریو سیحری ئەو، وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مانای (همزه ونفخه ونفثه) چییە ؟ فەرمووی:

---

١ /(قال الشيخ –رحمه الله–: أخرجه أحمد ١٥٦/٦ بإسناد صحيح إلى أبي سلمة. (الإرواء ٥٧/٢)،( صفة الصلاة :٩٥, ٩٦)

مانـــای (همــزه) دێوانـــەیی‌و شــێتییە کــە توشــی نـەوەکانی ئـادەم دەبێــت وە مانـاى (نفخـه) واتـه فیززلـی‌و لـووت بـەرزی‌و مانـای(نفثـه) بریتیـه لـه شیعر.

صفة الاستعاذة:- (شێوازی پەناگرتن)

٣١٢- أعـوذ بـالله الـسميع العلـيم مـن الـشيطان الــرجيم, مــن همــزه, ونفخـــه, ونفثـــه.) واتـــه : پــەنادەگرم بــه خــوای بیــسەرو زانـا لـه شـەیتانی نـەفرین لێکـراو لــه وەسوەسـەو شـێتی‌و شـیعرو سیحری ئەو)

٣١٣-أعوذ بالله من الشيطان الرجيم, من همزه , ونفخـه, ونفثـه..) واتــه : پــەنادەگرم بــه خــوا لــه

شەیتانی نەفرین لێکراو لە وەسوەسەو شێتیو شیعرو سیحری ئەو)

٣١٤– أعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم)[١].) واتە : پەنادەگرم بە خوای بیسەرو زانا لە شەیتانی نەفرین لێکراو)

٣١٥– أعوذ بالله من الشيطان الرجيم.)[٢] لقول الله تعالى: ﴿ وإما ينزغنك من الشيطان نزغ فاستعذ بالله إنه هو السميع العليم ﴾[٣].) واتە : پەنادەگرم بە خوا لە شەیتانی نەفرین لێکراو) خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وإما ينزغنك من الشيطان نزغ فاستعذ بالله إنه هو السميع العليم﴾

---

١ /.(الإرواء ٢/٣٥)

٢ /(هداية الرواة : ٢٣٥٤, ٢٣٥٥)

٣ /(فصلت :٣٦)

الأذان:ـ (بانگدان)

٣١٦- إن الشيطان إذا نودي بالصلاة أدبر)[١]

واتە : ئەگەر بانگدرا بۆ نوێژ ئەوا شەیتان پشت هەڵدەکاو دەڕوات.

قراء سورة البقرة : (خوێندنەوەی سورەتی البقره)

٣١٧- اقرءوا سورة البقرة في بيوتكم, فإن الشيطان لا يدخل بيتاً يقرأ فيه سورة البقرة)[٢] واتە : سورەتی (البقره) لە ماڵەکانتاندا بخوێننەوە، چونکە شەیتان ناچێتە ماڵێکەوە سورەتی (البقره)ی تێدا بخوێنرێتەوە.

---

١ /(صحيح الكلم : ١٠٨)

٢ /(الصحيحة: ١٥٢١)

٣١٨- إن كل شيء سناماً, وسنام القرآن سورة (البقرة)، وإن الشيطان إذا سمع سورة البقرة, خرج من البيت الذي يقرأ فيه سورة البقرة[١]. واته : هەموو شتێك كۆپارەی (چڵەپۆپە) هەیەو كۆپارەی قورئان سورەتی (البقرە)یەو ئەگەر شەیتان گوێی لە سورەتی (البقرە)بوو ئەوا لەو ماڵە دەردەچێت كە سورەتی (البقرە)ی تێدا دەخوێنرێتەوە.

## ١١٣- الدعاء لرد كيد مردة الشياطين

## پاڕانەوە بە مەبەستی ڕەتكردنەوەی فێڵی شەیتانی سەركەش

٣١٩- قام رسول الله (ﷺ) يصلي فسمعناه يقول: أعوذ بالله منك)) ثم قال: ((ألعنك بلعنة الله

١ /(الصحيحة: ٥٨٨)

(ثلاثاً))) وبسط يده كأنه يتناول شيئاً, فلما فرغ من الصلاة, قلنا يا رسول الله! سمعناك تقول في الصلاة شيئاً لم نسمعك تقوله قبل ذلك, ورأيناك بسطت يدك قال: ((إن عدو الله إبليس, جاء بشهاب من نار, ليجعله في وجهي, فقلت: أعوذ بالله منك (ثلاث مرات) ثم قلت: ألعنك بلعنة الله التامة (ثلاث مرات) فلم يستأخر, ثم أردت أخذه, والله لولا دعوة أخينا سليمان لأصبح موثقاً يلعب به ولدان أهل المدينة.[1] واته : پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستا بۆ نوێژکردن گوێمان لێ بوو دەیفەرموو : پەنا دەگرم بە خوا لە تۆ، ئەمجار فەرمووی : نەفەرتت لێ دەکەم بە نەفرەتی خوای گەورە (سێ جار) ئەمجار

١ /.(مختصر مسلم:٣٠٨)

دەستی درێژ کرد هەروەکو چۆن شتێك بە دەستی بگرێت، کاتێ لە نوێژەکەی بوویەوە وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێمان لێبوو لە نوێژەکەتدا شتێکت دەگوت کە هەرگیز نەمانبیستوە پێش ئەوە بیڵێیت، وە بینیمان دەستت کردەوە؟ فەرمووی: ئەوە دوژمنی خوا ئیبلیس بوو، بە بڵێسەیەك ئاگرەوە هاتبوو، بۆ ئەوەی بیخا بە روومدا، منیش وتم: پەنا دەگرم بە خوا لە تۆ (سێ جار) ئەمجار گوتم: نەفرەتت لێ دەکەم بە نەفرەتێکی تەواوی خوای گەورە (سێ جار)، بۆیە هیچ دوانەکەوت منیش ویستم بیگرم، سوێند بە خوا ئەگەر نزاکەی سلیمانی برام نەبوایە ئەوا دەمبەستەوەو منداڵانی شاری مەدینە یاریان پێ بکردبایە.

٣٢٠- أعوذ بكلمات الله التامات التي لا يجاوزهن بر ولا فاجر، من شر ما خلق، وذرأ وبرأ ومن شر ما ينزل من السماء ومن شر ما يعرج فيها ومن شر ما ذرأ في الأرض ومن شر ما يخرج منها ومن شر فتن الليل والنهار ومن شر كل طارق إلا طارقاً يطرق بخير يا رحمن)[١] واتە: پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوا کە هیچ چاکەکارێك‌و خراپەکارێك لێی تێناپەڕێت، لە خراپەی ئەوەی دروستی کردووەو زۆری کردووەو بەدیهێناوەو لە خراپەی ئەوەی لە ئاسمانەوە دادەبەزێت‌و ئەوەی تێیدا بەرز دەبێتەوە، لە خراپەی ئەوەی لە ژێر زەوی نراوەو خراپەی ئەوەی لێی دێتە دەرەوەو لە خراپەی

١ /( الصحيحة : ٢٩٩٥)

فیتنـەکانی شـەوانو ڕۆژان، وە لـە خراپـەی هـەموو کوتەرێك (بە شەو هاتوو) جگە لە کوتەرێکی خەیرو چاکە، ئەی بەخشندە..).

## ١١٤- ما يفعل من أصابه شك في إيمانه
## چی دەکات ئەگەر توشی گومان بوو لە ئیمانەکەیدا

٣٢١- يـأتي شيطان أحدكم فيقـول : مـن خلـق كذا؟ من خلق كذا؟ حتـى يقـول: مـن خلـق ربـك ؟! فإذا بلغه فليستعذ بالله ولينته[١]. واتە: شەیتان دێـت بـۆ لای هەریـەکێکتانو دەڵێـت : کـێ فـلان شـتی دروست کردووە؟ کێ فلان شتی دروسـت کـردووە؟ تـاوەکو دەڵێـت: کـێ پـەروەردگاری تـۆی دروسـت

---

١ /(الصحيحة: ١١٧)

کردووە؟ جا ئەگەر گەیشتە ئەو رادەیە ئەوا با پەنا بە خوا بگرێتو واز بهێنێ.

٣٢٢- إن أحدكم يأتيه الشيطان فيقول : من خلقك ؟ فيقول : الله، فيقول : فمن خلق الله؟فإذا وجد ذلك أحدكم فليقرأ آمنت بالله ورسله، فإن ذلك يذهب عنه [١].واتە : شەیتان دێت بۆ لای هەریەکێك لە ئێوەو دەڵێت : کێ تۆی دروست کردووە ؟ ئەویش دەڵێت : خوا، ئەویش دەڵێت : ئەی کێ خوای دروست کردووە ؟ جا ئەگەر ئەوەی بینی ئەوا با (آمنت بالله ورسله) بخوێنێتەوە، جا ئەوە دەبێتە هۆی دوور کەوتنەوە لێی.

---

١ / (الصحيحة : ١١٦)،( تراجع العلامة : ٢٠٦)

٣٢٣- يُوشِكُ الناسُ يتساءلُونَ بينهم, حتى يقولُ قائلُهُم: هذا اللهُ خَلَقَ الخَلْقَ, فمنْ خلَقَ الله عز وجل ؟ فإذا قالوا ذلك, فقولوا: الله أحدٌ. اللهُ الصمدُ. لم يلدْ ولم يولدْ. ولم يكُنْ لهُ كُفُواً أحدٌ﴾ ثم ليتفلْ أحدُكُم عنَ يسارِهِ ثلاثاً, وليستعِذْ من الشَّيطانِ)[١]

واتە : خەریکە وای لێدێت خەڵکی لە نێوان خۆیاندا پرسیار بکەن، تاوەکو یەکێکیان دەڵێت : ئەوە خوای گەورە هەموو دروستکراوەکانی دروست کردووە ئەی کێ خوای گەورەی دروست کردووە ؟ جا ئەگەر ئەوەیان گوت : بڵێن : خوای گەورە تاکو تەنهایە جێی نیازو مەبەستە، ئەو کەسەیە کە کەسی لێ نەبووەو لە کەسیشی لێ نابێت، هیچ

---

١ /(الصحيحة:١١٨)

کەسێك هاوشێوەی تۆ نییە, ئەمجار با سێ جار تف بکات بە لای چەپداو پەنا بگرێت بە خوا لە شەیتان.

٣٢٤- قال ابن عباس: (إذا وجدتَ في نفسكَ شيئاً فقلْ: هو الأولُ, والآخرُ, والظاهرُ, والباطنُ, وهو بكل شيءٍ عليم)[١] واتە: ئیبن عەباس دەفەرموێت: ئەگەر شتێکت لە نەفسی خۆتدا بینی (بە دیت کرد) ئەوا بڵێ: ئەو خودایە یەکەم کەسەو دوایین کەسەو، خاوەن دەسەڵاتو شکۆمەندیو پەنهانە، هەر ئەو بە ئاگاو زانیارە دەربارەی هەموو شتێك.

قال الشيخ محمد ناصر الدين الألباني -رحمه الله-: وخلاصتها أن يقول: آمنت بالله ورسله, الله

١ /(صحيح الكلم:١١١)

أحد, الله الصمد, لم يلد ولم يولد, ولم يكن لـه كفـواً أحد.وقول : (هو الأول, والآخـر, والظـاهر, والبـاطن, وهو بكل شيء عليم﴾ ثم يتفل عن يساره (ثلاثاً), يستعيذ بالله من الشيطان, ثم ينتهي عن الانسياق مع الوسواسة. وأعتقد أن من فعل ذلك, طاعة لله ورسوله, مخلصاً في ذلك، أنه لا بد أن تذهب الوسوسة عنه, ويندحر شيطانه لقول رسول الله(ﷺ) : (فإن ذلك يذهب عنه)). أهـ)[1]

واتـه : شـەیخ فەرموویەتی –ڕەحمەتی خوای لێبێت – : کورتەی باسەکە ئەوەیە کە بڵێت : باوەڕم بە خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) هێناوە، خوای گەورە تاکو تەنهایە جێی نیازو مەبەستە،

---

١ /(الصحيحة: ١/٢٣٦)

ئەو کەسەیە کە کەسی لێ نەبووەو لە کەسیشی لێ نابێت، هیچ کەسێك هاوشێوەی نییە، بڵێ : ئەو خودایە یەکەم کەسەو دوایین کەسەو، خاوەن دەسەڵاتو شکۆمەندیو پەنهانە، هەر ئەو بە ئاگاو زانیارە دەربارەی هەموو شتێك. ئەمجار سێ جار تف بکات بە لای چەپیداو پەنا بگرێت بە خوا لە شەیتان، ئەمجار با واز بهێنێ لە وەسوەسەکەی، باوەڕم وایە هەرکەسێك ئەوە بکات، وەکو گوێڕایەڵییەکی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، بە دڵسۆزییەوە، ئەوا وەسوەسەکەی لە سەر لا دەچێت،شەیتانی لێ دوور دەکەوێتەوە، لە بەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) : جا ئەوە دەبێتە هۆی لێ دوور کەوتنەوەی.

## ١١٥-العصمة من الدجال

## (خۆپاراستن لە دەجال)

شەیخ فەرموویەتی-ڕەحمەتی خوای لێبێت - :

ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی خۆپاراستن لە فیتنەی دەجال بریتین لەمانەی خوارەوە:

یەکەم: زۆر پەناگرتن بە خوا لە خراپەی فیتنەی دەجال، بە تایبەتی لە دوایین تەحیاتی نوێژەکاندا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی :

٣٢٥- إذا فرغ أحدكم من التشهد الآخر, فليستعذ بالله من أربع, يقول: اللهم إني أعوذ بك من عذاب جهنم, ومن عذاب القبر, ومن فتنة المحيا والممات, ومن شر فتنة المسيح الدجال)[١] واتە :-

---

١ /(صفة الصلاة: ١٨٢)

ئەگەر یەکێکتان دوایین تەحیاتی تەواوکرد ئەوا با پەنا بگرێت بە خوا لە چوار شت، دەڵێت : - ئەی خودایە.. من پەنات پێدەگرم لە سزای دۆزەخو لە سزای ناو گۆڕو لە فیتنەی ژیانو مردنو لە خراپەی فیتنەی (المسیح الدجال).))

بەڵکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە شێوەیەکی گشتی فەرمانی کردوە بە پەناگرتن لە فیتنەی دەجال هەروەکو لە فەرموودەکەی (زید ی کوڕی ثابت)دا هاتوە :

٣٢٦- قال (ﷺ) : تعوّذوا بالله من فتنة الدجال.

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : پەنا بگرن بە خوا لە فیتنەی دەجال.

دووەم : دە ئایەتی سەرەتای سورەتی (الكهف) لەبەر بکات (رەوان بکات) ئەوا لە فیتنەی دەججال پارێزراو دەبێت.

٣٢٧– فقد قال (ﷺ): من يحفظ عشر آيات من أول سورة الكهف عصم من فتنة الدجال)[1] واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: هەرکەسێك دە ئایەت لە سەرەتای سورەتی (الكهف) لەبەر بکات ئەوا لە فیتنەی دەججال پارێزراو دەبێت)

سێیەم: دوورکەوێتەوە لە دەججالو رووبەرووی نەبێتەوە، تەنها مەگەر دڵنیابێت کەوا زیانی پێناگەیەنێت، بە هۆی باوەڕەکەیەوە بە خوای

---

١ /(مختصر مسلم : ٢٠٩٨)

گەورەو ناسینی بە نیشانەکانی هەروەکو چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەصفی کردوە.

٣٢٨- لقوله (ﷺ) : من سمع بالدجال فلينأ عنه, فوالله إن الرجل ليأتيه وهو يحسب أنه مؤمن فيتبعه, مما يبعث به الشبهات.واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : هەرکەسێك هەواڵی دەرکەوتنی دەجالی بیست ئەوا با لێی دوور بکەوێتەوە، سوێند بە خوا کەسی وا دێت بۆ لای وا دەزانێت ئیماندارە کەچی شوێنی دەکەوێت، لە بەر بوونو وروژاندنی گومانەکان.

چوارەم : نیشتەجێی شاری مەککەو مەدینە بێت، چونکە ئەو دوو جێگایە لێی قەدەغەکراوەو جێگایەکی پڕ ئاسایشن.

٣٢٩–لقوله(ﷺ) : يجيء الدجال فيطأ الأرض إلا مكة والمدينة, فيأتي المدينة, فيجد بكل نقب من نقابها صفوفاً من الملائكة.)[١] واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : دەججال دێتو پێ دەنێتە سەر هەموو زەوی تەنها هەردوو شاری مەککەو مەدینە نەبێت، دێت بۆ شاری مەدینە دەبینێ لە هەموو دەروازەیەکیدا پۆل پۆل فریشتە راوەستاون)

هەروەها نمونەی ئەو دوو شارە مزگەوتی (الاقصی)و کێوی (الطور)، ئەوەش بزانە کەوا ئەو شارە پیرۆزانە خوای گەورە پارێزگاری کردوە بۆ دانیشتوانەکەی ئەوانە دەگرێتەوە کەوا ئیماندارێکی

---

١ /(الصحيحة: ٢٤٥٧)

خـوا بـە تـەنها پەرسـتی ڕاسـتن، هـەموو ئـەرك‌و مافەكانی جێبەجیٚ كردبێت بەرانبەر خواكەی)[١].

## ١١٦- ما جاء في الرقى

## ( ئەو فەرموودانەی دەربارەی ڕوقیە هاتوون )

٣٣٠-انطلق نفر نا أصحاب النبي (ﷺ) في سفرة سافروها حتى نزلوا على حي من أحياء العرب، فاستضافوهم. فأبوا أن يضيفوهم. فلدغ سيد ذلك الحي، فسعوا له بكل شئ، لا ينفعه شئ، فقال بعضهم: لو أتيتم هولاء الرهط الذين نزلوا، لعله أن يكون عند بعضهم شئ، فأتوهم فقالوا: يا أيها الرهط، إن سيدنا لدغ، وسعينا له بكل شئ، لا ينفعه، فهل عند أحد منكم من شيء؟ فقال بعضهم:

---

١ /(قصة المسيح الدجال ونزول عيسى: ٣٤،٣٣)

والله إنـي لأرقـي ولكـن،والله لقـد استـضفناكم فلـم تضيفونا، فما أنا براقٍ لكم حتـى تجعلـوا لنـا جعـلاً، فصالحوهم على قطيع من الغنم، فانطلق يتفـل عليـه ويقرأ: ﴿الحمـد لله رب العـالمين﴾ فكأنمـا نـشط مـن عقال، فانطلق يمـشي ومـا بـه قلبـة، قـال: فـأوفوهم جعلهم الذي صالحوهم عليه، فقال بعضهم: اقـسموا، فقال الذي رقى: لا تفعلوا حتى نأتي رسول الله (ﷺ) فنذكر له الذي كان فننظـر مـا يأمرنـا، فقـدموا علـى رسول الله (ﷺ) فـذكروا لـه فقـال: (ومـا يـدريك أنهـا رقية) ثم قـال : قـد أصـبتم، اقـسموا، واضـربوا لـي معكم سهماً، فضحك النبي (ﷺ))[١] واته: كۆمەڵێك لـه هـاوەڵانی پێغەمبـەر (ﷺ) چـوون بـۆ گەشـتێك لـه

---

١ /(مختصر مسلم : ١٤٤٩)

ڕێگادا لایاندایە لای هۆزێك لە هۆزەكانی عەرەبو داوایان لێكردن بمێننەوەو میوانداریان بكەن، بەڵام ئەوان بە دەمیانەوە نەچوونو میوانداریایان لێنەكردن، پاشان گەورەی ئەو هۆزە شتێك پێوەی داو گەستی، هەموو هەوڵێكیان لە گەڵدا كەچی سوودی نەبوو، لەبەر ئەوە هەندێكیان لە نێو خۆیاندا وتیان: با بچین بۆ لای ئەو كۆمەڵە پیاوە بزانین شتێكیان پێ نییە وەكو چارەسەر. پاشان چوون بۆ لایانو پێیان وتن: ئەی كۆمەڵە پیاوەكە، گەورەكەمان گەزراوەو هەموو شتێكمان بۆ كردوە كەچی بێ سوود بووە، ئایا كەسێكتان هیچی پێ نییە؟ یەكێكیان وتی: بەڵێ سوێند بە خوا من دوعاچارە (روقیە) دەكەم، بەڵام سوێند بە خوا ئیمە داوای میوانداریمان لێ كردن گوێتان نەداینێ

بۆیە هەتا بەخششمان نەدەنیٚ بۆتان ناكەین. لە بەر ئەوە لە سەر گەلە مەڕێك ڕێككەوتن ئینجا ڕۆیشت ﴿الحمد لله رب العالمين﴾ی بە سەردا ئەخوێندو فووی پیا ئەكرد هەتا وا چاك بوویەوە هەروەكو هیچ پێوەی نەدابیٚ، دەستی بە ڕێكردن كردو هیچ ناساغییەكی نەما، بۆیە ئەوانیش ئەو بەڵێنەی كە پێیان دابوو جێبەجێیان كردو گەلە مەڕەكەیان پێدان، هەندێكیان وتیان : بەشی بكەن، بەڵام ئەوەی كە خۆی ڕوقییەكەی كردبوو وتی : بەشی مەكەن تاوەكو دەچین بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)و ئەوەی كە ڕویدا باسی بۆ دەكەینو بزانە فەرمانمان بە چی پیٚ دەكات، ئەمجار ڕۆیشتن بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)و باسی ڕووداوەكەیان بۆ كردن، ئەویش فەرمووی:

چۆن زانیت ئەو سورەتە روقییەیە ؟ ئەمجار فەرمووی : بە راستی پێکاتان، بەشی بکەنو لە گەڵ خۆتاندا پشکێکی منی تێبکەن، ئەمجار پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێکەنی.

٣٣١-عن خارجة بن الصلت عن عمه علاقة بن صحار أنه مر بقوم فأتوه، فقالوا : إنك جئت من عند هذا الرجل بخير، فارق لنا هذا الرجل، فأتوه برجل معتوه في القيود، فرقاه بأم القرآن ثلاثة أيام غدوة وعشية، كلما ختمها جمع بزاقه ثم تفل، فكأنما أنشط من عقال، فأعطوه شيئاً فأتي النبي (ﷺ) فذكر له، فقال النبي (ﷺ) : (كل فلعمري لمن أكل برقية باطل، لقد أكلت برقية الحق)[١] واته : له

---

١ /(الصحيحة:٢٠٢٧)

(خارجــە)ی کــوڕی (الــصلت)ەوە لــە مامییــەوە (علاقــە)ی کــوڕی (صــحار) کــەوا بــە تەنیــشت کۆمەڵێکدا تێپەڕیوەو ئەوانیش وتویانە: تۆ لای ئەو پیـاوە پـڕ خـەیرەوە هـاتووی، داوات لـێ دەکـەین روقییەیەك بۆ ئەم پیاوە بکەیت، ئەمجار هێنایان بۆ لای کابرایەکی شێتۆکە کە بەستبویانەوە، ئـەویش بـۆ مـاوەی سـێ ڕۆژ بـەیانیو ئێـوارە سـورەتی (الفاتحــة) بەســەردا دەخوێنــد، هــەرکاتێ تــەواوی بکردبایـە تفەکـەی لـە دەمـدا کۆدەکردەوەو پێیـدا دەپژانـد، ئـەمجار کـابرا چـاك بویـەوە، ئـەوانیش شـتێکیان پێـدا، ئـەویش هـات بـۆ لای پێغەمبـەری خـواو(ﷺ) باسـی بـۆ کـرد، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)

فەرمووی: بخۆ، سوێندبێ[1]، ئەگەر خەڵکی لە روقییەی نارەوا خواردبێتی ئەوا تۆ لە روقیەی حەق خواردوتە).

٣٣٢- كان رسول الله (ﷺ) إذا مرض أحد من أهله نفث عليه بالمعوذات وهي: ﴿قل هو الله أحد﴾، ﴿قل أعوذ برب الفلق﴾، ﴿قل أعوذ برب الناس﴾[2]
واتە: ئەگەر یەكێ لە كەسوكارەكەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەخۆش بكەوتایە ئەوا فووی دەكردە بە سەریداو لە گەڵیدا ئەم سورەتانەی دەخوێند: ﴿قل هو الله أحد﴾، ﴿قل أعوذ برب الفلق﴾، ﴿قل أعوذ برب الناس﴾.

---

١ چونكە خوای گەورە سوێندی بە تەمەنی پێغەمبەری خوا خواردوە هەروەكو دەفەرموێت : ( لعمرك إنهم لفي سكرتهم يعمهون) هەروەها هەندێ لە زانایان دەڵێن ئەو(لام)ە (لام الأبتداء)ە نەك (لام القسم)

٢ /(مختصر مسلم : ١٤٤٦)

٣٢٣- أن النبي (ﷺ) كان إذا اشتكى الإنسان الشيء منه أو كانت به قرحة أو جرح، قال النبي (ﷺ) بإصبعه هكذا، ووضع سفيان بن عيينة سبابته بالأرض، ثم رفعها وقال : (بسم الله تربة أرضنا بريقة بعضنا يشفى سقيمنا بإذن ربنا)[1] واته : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر كەسێك ئازاری هەبوایە یان برینو زامێكی پێوه بوایە ئەوا پەنجەی بەم شێوه لێدەكرد، جا (سفیان)ی كوڕی (عیینە) پەنجەی دەخستە سەر زەویو ئەمجار بەرزی كردەوەو فەرمووی: بە ناوی خوا، خۆڵی زەوییەكەمام بە لیكی هەندێكمان، شیفای نەخۆشەكانمان بدات بە ئیزنی پەروەردگارمان).

---

١ /(مختصر مسلم:١٤٥٨)(مختصر البخاري:٢٢٤٩)

٣٣٤- عن عائشة أن النبي (ﷺ) كان يعوذ بعض أهله،يمسح بيده اليمنى ويقول : اللهم رب الناس أذهب البأس، وأشف أنت الشافي لا شفاء إلا شفاؤك شفاء لا يغادر سقماً، فلما ثقل في مرضه الذي مات فيه أخذت بيده فجعلت أمسحه بها وأقولها)[١] واته: له عائیشەوە ریوایەت کراوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەندێ لە کەس و کارەکەی پەنا دەدایە خواو بە دەستی راست دەیسڕی و دەیفەرموو: ئەی خودایە.. پەروەردگاری هەموو خەڵکی.. ئازارەکەی لابەرەو شیفای بدەو چونکە تەنها تۆ شیفا دەدەیت، هیچ شیفاو چارەسەرێك نییە تەنها شیفاو چارەسەری تۆ نەبێت چارەسەرێك کە هیچ

١ /(الصحیحة:٢٧٧٥)

دەردێك بە جیّ نەهێلێت، کاتی نەخۆشییەکەی کە پێوەی وەفاتی کرد لە سەری گران بوو دەستەکانی ئەوم گرتو جەستەییم پیّ دەسڕیو ئەو روقییەیەم دەخوێند.

٣٣٥-امسح البأس، رب الناس بيدك الشفاء لا كاشف له إلا أنت)[١] واتە : ئازارەکەی بسڕەو لایبەرە، ئەی پەروەردگاری خەڵکی شیفا بە دەستی تۆیە، هیچ کەسێك ناتوانێت ئازار لابەرێت تەنها تۆ نەبێت.

٣٣٦- امسح البأس، رب الناس بيدك الشفاء لا يكشف الكرب إلا أنت)[٢] واتە : ئازارەکەی بسڕەو

---

١ /( مختصر البخاري:٢٢٤٨)

٢ /( الصحيحة: ١٥٢٦)

لایبەرە، ئەی پەروەردگاری خەڵکی شیفا بە دەستی تۆیە، هیچ کەسێك ناتوانێت ئەشکەنجەو ئازار لابەرێت تەنها تۆ نەبێت.

٣٣٧- اذهب البأس، رب الناس بیدك الشفاء لا کاشف لە إلا أنت)[1] واتە: ئازارەکەی بسڕەو لایبەرە، ئەی پەروەردگاری خەڵکی شیفا بە دەستی تۆیە، هیچ کەسێك ناتوانێت ئازار لابەرێت تەنها تۆ نەبێت.

٣٣٨- اکشف البأس، رب الناس إلە الناس)[2] واتە : ئازارەکەی لابەرە، ئەی پەروەردگاری خەڵکی.. ئەی خودای خەڵکی.

---

١ /( مختصر مسلم : ١٤٦١)

٢ /(الصحیحة: ١٥٢٦)

٣٣٩- بسم الله أرقيك، من كل شيء يؤذيك، من شر كل نفس أو عين حاسد، الله يشفيك، بسم الله أرقيك)[1] واته: به ناوی خوا دوعاچارەت بۆ دەکەم، له - خراپەی - هەموو شتێك ئازارت بداتو له خراپەی هەموو نەفسێك(دەروونێك) یان چاوی حەسودێك، خوا شیفات بدات، به ناوی خوداوه دوعاچارەت بۆ دەکەم.

٣٤٠- بسم الله يبريك، ومن كل داء يشفيك، ومن شر حاسد إذا حسد، وشر كل ذي عين.)[2] واته : به ناوی خوداوه چارەسەرت بکات، وه له هەموو نەخۆشییەك شیفات بدات، وه له خراپەی هەموو

---

١ /( مختصر مسلم: ١٤٤٤) (الصحيحة: ٢٠٦٠)

٢ / (مختصر مسلم : ١٤٤٣)

حەسودێك ئەگەر حەسوودی ببات، وە لە خراپەی هەموو خاوەن چاوێك(واتە : چاوپیسێك)

٣٤١- عن عثمان بن أبي العاص قال قلت : يا رسول الله (ﷺ) عرض لي شيء في صلواتي، حتى ما أدري ما أصلي، قال : ذاك الشيطان ادنه. فدنوت منه، فجلست على صدور قدمي قال : فضرب صدري بيده، وتفل في فمي، وقال: اخرج عدو الله، ففعل ذلك ثلاث مرات. ثم قال : (الحق بعملك، قال عثمان : فلعمري ! ما أحسبه خالطني بعدُ)[1] واتە: لە (عثمان) کوڕی (أبو العاص)ەوە دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نوێژەکەمدا شتێکم بۆ هات (هات بە سەرمدا) تاوەکو ئەوەی نەمدەزانی چی نوێژ دەکەم، فەرمووی: ئەوە شەیتانە، لێم

---

١ /(صحيح ابن ماجه:٣٦١٤)

نزیك بەرەوە، منیش لێی نزیك بوومەوەو لە سەر سنگی پێیەكانم دانیشتم، دەڵێت: بە دەستەكانی دای لە سنگمو تفی كرد بە دەممداو گوتی: دەرچۆ ئەی دوژمنی خوا، جا ئەوەی سێ جار دووبارە كردەوەو ئەمجار فەرمووی: بگەرە كارەكەت، عوسمان دەڵێت: سوێندبێ، چیتر هەرگیز تێكەڵم نەبوو.

٣٤٢- لدغت النبي (ﷺ) عقرب وهو يصلي، فلما فرغ قال : لعن الله العقرب، لاتدع مصلياً ولا غيره، ثم دعا بماءٍ وملحٍ وجعل يمسح عليها ويقرأ: ﴿قل يا أيها الكافرون﴾، ﴿قل أعوذ برب الفلق﴾، ﴿قل أعوذ برب الناس﴾[١] واتە: دووپشكێك لە كاتی نوێژدا دای بە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، كاتێ لە

١ /(الصحيحة :٥٤٨)

نوێژەکەی بووەوە فەرمووی : لەعنەتی خوا لە دووپشك، واز لە نوێژەرو جگە لە نوێژەر ناهێنێ، ئەمجار داوای هەندێ ئاوو خوێ کردو پاشان دەستی بە سڕینی جێگەکەی کردو ئەو سورەتانەی دەخوێندەوە : ﴿قل يا أيها الكافرون﴾,﴿قل أعوذ برب الفلق﴾,﴿قل أعوذ برب الناس﴾

## ١١٧-ما يعوذ به الأولاد

## ئەوەی کە منداڵەکانی پێ پەنا دەگرت

٣٤٣- أعيذكما بكلمات الله التامة من كل شيطان و هامة و من كل عين لامة. ويقول: (إن أباكما كان يعوذ بها إسماعيل وإسحاق.)[١] واتە: پەناتان دەدەم بە وتە تەواوەکانی خوا لە هەموو

---

١ /(صحيح ابن ماجه:٣٥٠) (صحيح الكلم الطيب : ١١٨)

شەیتانێكو لە هەموو زیندەوەرێکی زیان بەخشو لە هەموو چاوێکی لۆمەکراوی زیان بەخش. ئەمجار دەیەفەرموو: باوکتان – ئیبراهیم– بەم دوعایە هەردووکوڕەکەی _ئیسماعیلو ئیسحاقی– پەنا دەدا.

## ١١٨- الشيء يراه ويعجبه ويخشى أن يصيبه بعينه

## ئەگەر شتێکی بینی سەرسامی کردو سەرنجی ڕاکێشاو لەوە ترسا توشی چاوی خۆی بێت

٣٤٤– إذا رأى أحدكم من نفسه أو ماله من أخيه ما يعجبه فليدع له بالبركة فإن العين حق.)[١] واتە: ئەگەر یەکێکتان لە نەفسی خۆیدا یان لە ماڵی براکەیدا شتێکی سەرنج ڕاکێشی بینی ئەوا با

---

١ /(صحیح الجامع : ٥٥٦)

دوعای بەرەکەتی بۆ بکات، چونکە چاو راستەو حەقە).

## ١١٩- الدعاء لمن أحس وجعاً في جسده
## دوعای کەسێك ئەگەر هەستی بە ئازارێك کرد لە جەستەیدا

٣٤٥- ضع يدك على الذي يألم من جسدك وقل: بسم الله ثلاثا، وقل سبع مرات: أعوذ بالله وقدرته من شر ما أجد و أحاذر)[1] واتە: دەست بخەرە سەر ئەو جێگەیەی کە ئازارت دەدات لە جەستەتداو بڵێ: (بسم الله) سێ جار، ئەمجار حەوت جار بڵێ: پەنا بە عیززەتو توانای خوا دەگرم لە خراپەی ئەو ئازارەی هەستی پێدەکەمو خۆمی لێدەپارێزم.

---

١ /(مختصر مسلم: ١٤٤٧)

٣٤٦- إذا اشتكيت فضع يدك حيث تشتكي، وقل: بسم الله وبالله، أعوذ بعزة الله وقدرته من شر ما أجد من وجعي هذا، ثم ارفع يدك ثم أعد ذلك وتراً)[١] واته : ئەگەر هەستت بە ئازارێك كرد ئەوا دستت بخەرەوە سەر جێگەی ئازارەكەو بڵێ : (بسم الله و بالله) : پەنا بە عیززەتو توانای خوا دەگرم لە خراپەی ئەم ئازارەی هەستی پێدەكەم، ئەمجار دەستت بەرز بكەرەوەو چەند جارێك دووبارەی بكەرەوە.

١ /( الصحيحة: ١٢٥٨)

## ١٢٠-الدعاء للمريض

## پاڕانەوە بۆ نەخۆش

٣٤٧- يجلس عند رأسه ثم يقول سبع مرات، أسأل الله العظيم، رب العرش العظيم أن يشفيك فإن كان في أجله تأخير عوفي من وجعه)[١] واته : لە سەری دادەنیشتو حەوت جار دەیفەرموو : داوا لە خوای مەزن دەکەم، خاوەنی عەرشی مەزن کە شیفات بدات، جا ئەگەر لە ئەجەلەکەیدا دواکەوتن نوسرابێت ئەوا لە ئازارەکەی چاك دەبێتەوە.

٣٤٨- اللهم اشف عبدك ينكأ لك عدواً، أو يمشي لك إلى الصلاة.)[٢] واتە : ئەی خودایە.. بەندەکەت

١ /(صحيح الأدب المفرد: ٥٣٦)

٢ /(الصحيحة:١٣٦٥)

چارەسەر بکە دوژمنەکەت بۆ ببەزێنێت،یان لە بەر تۆ بەرەو نوێژەکان بڕوات.

٣٤٩- لا بأس طهور ان شاء الله تعالى [١]. واتە : هیچ نییە لە تاوانەکان پاك دەبیتەوە بە ویستی خوا.

٣٥٠- قال سعد بن أبي وقاص أنه (ﷺ) : مسح يده على وجهي وبطني ثم قال (ﷺ) : اللهم اشف سعداً، (ثلاثاً) [٢] واتە : سعد ی کوڕی أبو وقاص دەفەرموێت : کەوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە دەستەکانی دەموچاوو سکی منی سڕیو ئەمجار فەرمووی: ئەی خودایە شیفای سەعد بدە.(سێ جار).

---

١ /(مختصر البخاري:٢٢٢١)

٢ /(مختصر البخاري:٦٢٦)،(صحيح الأدب المفرد: ٥٢٠)

## ١٢١-الدعاء عند رؤية أهل البلاء
## پاڕانەوە لە کاتی بینینی ئەوانەی توشی بەڵا هاتوو

٣٥١-الحمد لله الذي عافاني مما ابتلاك به، وفضلني على كثير ممن خلق تفضيلا [١]. واتە : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە منی لەشساغ کردووە و پاراستومیەتی لەوەی توشی تۆ بووە، وە فەزڵی منی داوە بە سەر زۆرێك لەوانەی کە دروستی کردووە بە فەزڵی خۆی.

٣٥٢- الحمد لله الذي عافاني مما ابتلاك به، وفضلني عليك، وعلى كثير من عباده تفضيلا [٢].

---

١ /(الصحيحة : ٢٧٣٧/٦٠٢)

٢ /(صحيح الجامع :٥٥٥)

واتە : سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی کە منی لەشساغ کردووەو پاراستومیەتی لەوەی توشی تۆ بووە،وە فەزڵی منی داوە بە سەر تۆداو بە سەر زۆرێك لە بەندەکانیدا بە فەزڵی خۆی.

## ١٢٢- ما يقول إذا تطير بشيء

## پاڕانەوەی بە دڵدا هاتنی ڕەشبینیو شوومی

٣٥٣- إذا تطيرتم فامضوا، وعلى الله توكلوا.[١]

واتە: ئەگەر بە شتێك ڕەشبین بوون ئەوا بڕۆنو بەردەوام بنو پەنا بە خوا بگرن.

٣٥٤- اللهم لا طير إلا طيرك، ولا خير إلا خيرك ولا إله غيرك[٢]. واتە : ئەی خودایە.. هیچ ڕەشبین

---

١ /(الصحيحة : ٢٩٤٢)

٢ /(الصحيحة: ١٠٦٥)

نیم بەرانبەر شتێك تەنها ئەوە نەبێت خۆت بە خراپت داناوەو خەیرو چاکەش لە هیچ شتێکەوە نییە تەنها ئەوە نەبێت کە لە لای خۆتەوە دێت، وە جگە لە تۆ هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت.

## ١٢٣- كراهية الموت

## حەزنەکردن لە مردن

٣٥٥- لا يتمنين أحدكم الموت لضر نزل به ، فإن كان ولا بد فاعلا ، فليقل : اللهم أحيني ما كانت الحياة خيرا لي ، وتوفني إذا كانت الوفاة خيرا لي))[1]

واتە : با هیچ کەس لە ئێوە خۆزگە بە مردن نەخوازێت لە بەر زیانو زەرەرێك کە پێی دەگات،

١ /( صحيح الترغيب: ٣٢٧٠)

ئەگەر هەر ناچار بوو بیڵێت ئەوا با بڵێت : خودایە بمژێنە تا ئەو کاتەی ژیان بۆ من باشترەو بممرێنە ئەگەر مردن بۆ من باشترە).

٣٥٦- لا يتمنين أحدكم الموت، ولا يدع به قبل أن يأتيه، وإنه إذا مات انقطع عمله، وإنه لا يزيد المؤمن عمره إلا خيراً[١]. واتە: با هیچ کەس لە ئێوە خۆزگە بە مردن نەخوازێتو با داوای نەکات لە پێش ئەوەی پێی دەگات، چونکە ئەگەر بمرێت چیتر کردەوەکانی دەبچرێتو نامێنێت، وە زیاد بوونی تەمەنی ئیماندار تەنها چاکەی بۆ زیاد دەکات.

---

١ /(مختصر مسلم: ١٨٨٥)

## ١٢٤- دعاء المريض إذا يئس من حياته

## پاڕانەوەی نەخۆشێك ئەگەر بێ ئومێد بوو بوو لە ژیان

٣٥٧- إذا قال العبد : لا إله إلا الله، والله أكبر، قال الله -عز وجل- : صدق عبدي، لا إله إلا أنا، وأنا أكبر، وإذا قال العبد، لا إله إلا الله وحده، قال : صدق عبدي، لا إله إلا أنا وحدي، وإذا قال : لا إله إلا الله لا شريك له، قال : صدق عبدي، لا إله إلا أنا ولا شريك لي، وإذا قال : لا إله إلا الله له الملك وله الحمد، قال : صدق عبدي، لاإله إلا أنا لي الملك، ولي الحمد وإذا قال : لا إله إلا الله ولا حول ولا قوة إلا بالله قال : صدق عبدي لا إله إلا أنا ولا حول ولا قوة إلا بي، من رزقهن عند موته لم تمسه النار[١].

---

١ /(الصحيحة :١٣٩)

واتە : ئەگەر بەندەیەك وتی : هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێتو خوا لە هەموو گەورەترە، خوای گەورە دەفەرموێت : بەندەکەم ڕاستی گوت، هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها من نەبێتو من لە هەموو گەورەترم، وە ئەگەر بەندەکە وتی : هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت تاكو تەنهایە، خوای گەورە دەفەرموێت : بەندەکەم ڕاستی گوت هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها من نەبێت من تاكو تەنهام، وە ئەگەر وتی : هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت هیچ هاوەڵێکی نییە، خوای گەورە دەفەرموێت : بەندەکەم ڕاستی گوت هیچ

خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها من نەبێت هیچ هاوەڵێکم نییە،، وە ئەگەر وتی : هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت، هەموو سوپاس‌و ستایش‌و موڵك تەنها بۆ ئەوە، خوای گەورە دەفەرموێت : بەندەکەم راستی کرد هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها من نەبێت‌و هەموو موڵکێك بۆ منە، سوپاس‌و ستایشیش بۆ منە، وە ئەگەر وتی : هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت، هیچ تواناو هێزێك نییە تەنها بە خوا نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت : بەندەکەم راستی کرد هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها من نەبێت‌و هیچ تواناو هێزێك نییە تەنها بۆ من نەبێت،

هەرکەسێك خوای گەورە ئەم چەند وشانەی بە نسیب کرد لە کاتی سەرەمەرگدا ئەوا ئاگر بەری جەستەی ناکەوێت.

٣٥٨– اللهم اغفر لي وارحمني وألحقني بالرفيق الأعلى[1]. واتە : ئەی خودایە.. لە تاوانەکانم خۆشبەو بەزەییت پێمدا بێتەوەو بمگەیەنە بە هاوریانی پلە بەرز.

## ١٢٥– التلقين عند الموت

## تەلقین کردن لە کاتی سەرەمەرگدا

٣٥٩– لقنوا موتاكم : لا اله الا الله فإنه من كان آخر كلامه لا اله الا الله عند الموت دخل الجنة يوماً

---

١ /(الصحيحة : ٢٧٧٥)

من الدهر، وإن أصابه قبل ذلك ما أصابه[١]. واتە : تەلقینی مردووەکانتان بکەن بە (لا الە الا الله) چونکە هەرکەسێك دوایین وشەی (لا اله الا الله) بێت لە کاتی مردندا ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە رۆژێك لە رۆژان، هەرچەندە لەوەو پێش ئەوەی توشی بووە تۆشی بووە.

قال الشیخ – رحمه الله – : ولیس التلقین ذکر الشهادة بحضر المیت وتسمیعها إیاه، بل هو أمره بأن یقولها، خلاف لما یظن البعض. ا هـ.[٢] واتە : شەیخ فەرموویەتی –رەحمەتی خوای لێ بێت– تەلیقن بەو شێوەیە نییە کە شایەتمان دەدەنە بەر

١ /(صحیح الموارد : ٧١٩)

٢ /( أحکام الجنائز : ٢٠١٩)

گوێیدا لە کاتی سەرەمەرگدا، بەڵکو ئەو فەرمانی پێکردووە کە بیڵێت، بە جیاواز لە گەڵ ئەوانەی کە وا دەزانن.

## ١٢٦- الدعاء عند الميت

## پاڕانەوەی لای مردوو

٣٦٠- اللهم اغفر (لأبي سلمة) و أرفع درجته في المهديين واخلفه في عقبه في الغابرين واغفر لنا وله يا رب العالمين و افسح له في قبره ونور له فيه[1]. واتە : ئەی خودایە.. لە تاوانەکانی (ابو سلمە) خۆشبەو پلەی بەرز بکەرەوە لە ناو ڕێنموییکراوەکانداو لە نەوەکەیدا کەسانی باش بهێڵەوە کە بەرژەوەندییەکانی بپارێزن، لە تاوانەکانی ئێمەو

---

١ /(مختصر مسلم : ٤٥٦)

ئـەویش خۆشـبە ئـەی پــەروەردگاری جیهانیــان‌و گۆڕەکەی بۆ فراوان بکەرەوەو روناکی بکەرەوە.

٣٦١- اللهم اغفر لـي ولـه، واعقبني منـه عقبى حسنة [١]. واتە : ئەی خودایە لە تاوانەکانی من‌و ئەو خۆشبەو چاکەیەکی باشترم لە شوێنەکەی بۆ دانێ.

## ١٢٧- الدعاء لمن أصيب بمصيبة

## پاڕانەوەی کەسێك توشی موصیبەتێك هاتبێت

٣٦٢- ما من عبد تصيبه مصيبة فيقول: انا لله وانا اليه راجعون، اللهم اجرني في مـصيبتي واخلـف لي خيرا منهـا، الا اجره الله في مـصيبته واخلـف لـه خـيرا منهـا [٢]. واتــە : هــیچ بەندەیــەك توشــی

---

١ /(مختصر مسلم : ٤٥٢)

٢ /((مختصر مسلم : ٤٦١)

موصـــیبەتێك نابێـــتو بڵێـــت : ئێمـــە هـــەموو هـــی خـــواینو هـــەر بـــۆ لای ئـــەو دەگەڕێینـــەوە، ئـــەی خودایە.. پاداشتم بدەرەوە لەم موصیبەتەداو لەوە باشترم لە جێگـەی بـۆ دابـنێ، ئیللا خـوای گـەورە پاداشتی موصیبەتەکەی دەداتـەوەو لـەوە باشـتری لە جێگەی بۆ دادەنا.

٣٦٣- إذا مـــات ولـــد الرجـــل یقـــول الله تعـــالى لملائکتـــه : أقبـــضتم ولـــد عبـــدي ؟ فیقولـــون : نعـــم، فیقـــول : أقبـــضتم ثمـــرة فـــؤاده ؟ فیقولـــون : نعـــم، فیقـــول : فمـــاذا قـــال عبـــدي ؟ فیقولـــون : حمـــدك واسترجع، فیقول : ابنـوا لعبـدي بیتـاً وسمـوه بیـت الحمـد [١]. واتـە : ئەگـەر منـداڵی کەسـێك مـرد ئـەوا

١ /(الصحیحة: ١٠٤٨)

خوای گەورە بە فریشتەکانی دەڵێت : ئایا رۆحی منداڵی بەندەکەی منتان کێشا ؟ ئەوانیش دەڵێن : بەڵێ : دەڵێت : ئایا جگەر گۆشەکەی ئەوتان رۆح کێشا ؟ ئەوانیش دەڵێن : بەڵێ، خوای گەورە دەفەرموێت : ئەی بەندەکەم چی گوت : ئەوانیش دەڵێن : (الحمد لله)و (إنا لله إنا إليه راجعون) وت، ئەویش دەڵێت : ماڵێك بۆ بەندەکەم دروست بکەن‌و ناوی بنێن ماڵی (الحمد).

## ١٢٨- الدعاء للميت في صلاة الجنازة
## پاڕانەوە بۆ مردوو لە کاتی نوێژی جەنازە

٣٦٤- اللهم اغفر له وارحمه وعافه واعف عنه واكرم نزله ووسع مدخله واغسله بالماء والثلج والبرد ونقه من الخطايا كما نقيت الثوب الابيض من الدنس

وابدله دارا خيرا من داره واهلا خيرا من اهلـه وزوجـا خيرا من زوجه وادخله الجنة واعذه مـن عذاب القـبر ومـن عـذاب النـار [١]). واتــه : ئـەی خودایـه.. لـه تاوانـەكانی خۆشـبەو بـەزەییت پێـدا بێتـەوەو بیپارێزەو لێی خۆشبەو جێگەو پێگەی بەرزو بەڕێز بكەو شوێنی بۆ فراوان بكەو به ئـاوو بـەفرو تـەرزە بشۆرەوەو له تاوانەكانی پـاكی بكـەرەوه هـەروەكو چـۆن جلـی سـپیت لـه پیـسی پـاك كردوەتـەوەو مـاڵێكی پـێ ببەخـشه لـه ماڵەكـەی خـۆی باشـترو چاكتر بێتو كەسوكارێك لـه كەسوكارەكەی خـۆی باشترو چاكتر بێتو خێزانێك لـه خێزانەكـەی خـۆی باشترو چـاكتر بێـتو بیخـەره بەهەشتەوەو پـەنای بده له سزای گۆڕو له سزای ئاگر.

---

١ /(أحكام الجنائز : ١٥٧)

٣٦٥- اللهم اغفر لحينا ، وميتنا ، وشاهدنا، وغائبنا، وصغيرنا وكبيرنا، وذكرنا وأنثانا، اللهم من أحييته منا فأحيه على الاسلام، و من توفيته منا فتوفه على الإيمان، اللهم لا تحرمنا أجره ولا تضلنا بعده[١]. واتە: ئەی خودایە.. لە زیندووەکانمانو مردووەکانمانو ئامادەبووەکانمانو ئامادەنەبووەکانمانو بچووکەکانمانو گەورەکانمانو نێرەکانمانو مێیەکانمان خۆشبە، ئەی خودایە.. ئەو کەسەی لە ئێمە دەیژێنیت ئەوا لە سەر ئیسلامەتی بیژێنەو ئەوەی دەیمرێنێت ئەوا لە سەر ئیمان بیمرێنە، ئەی خودایە بێ بەشمان مەکە لە پاداشتەکەیو لە پاش ئەو گومڕامان مەکە.

---

١ /(صحيح ابن ماجه : ١٥٢٠)

٣٦٦- اللهم إن فلان ابن فلان في ذمتك ، وحبل جوارك ، فقه فتنة القبر وعذاب النار ، وأنت أهل الوفاء والحق ، فاغفر له وارحمه إنك أنت الغفور الرحيم [١]. واتە : ئەی خودایە.. ئەوا فڵانی کوڕی فڵان لە سایەو پارێزگاری تۆدایە،و لە پەنای تۆدایە، لە فیتنەی گۆڕو سزای ئاگر بیپارێزە، تۆ خاوەنی وەفاو خاوەنی حەقی، لە تاوانەکانی خۆشبەو بەزەییت پێیدا بێتەوە هەر تۆ لێبوردەو بە بەزەییت.

٣٦٧- اللهم عبدك وابن أمتك احتاج إلى رحمتك، وأنت غني عن عذابه ، إن كان محسناً فرد في حسناته ، وإن كان مسيئاً فتجاوز عنه. ثم يدعو ما

---

١ /(صحيح ابن ماجه : ١٥٢١) (صحيح أبي داود : ٣٢٠٢)

شاء أن يدعو[١]. واتە: ئەی خودایە.. بەندەو کوڕی کۆیلەکەت پێویستی بە بەزەیی تۆیە، تۆ زۆر دەوڵەمەندي لە سزادانی ئەوو بێ نیازی، جا ئەگەر چاکەکار بوو ئەوا بە چاکی پاداشتی بدەرەوەو ئەگەر خراپەکار بوو ئەوا لە تاوانەکانی خۆشبە، ئەمجار بە ویستی خۆی بۆی دەپاڕێتەوە.

## ١٢٩- الدعاء للطفل

## پاڕانەوە بۆ منداڵ

٣٦٨- اللهم اغفر لحينا ، وميتنا ، وشاهدنا ، وغائبنا ، وصغيرنا وكبيرنا ، وذكرنا وأنثانا ، اللهم من أحييته منا فأحيه على الإسلام ، و من توفيته منا فتوفه على الإيمان ، اللهم لا تحرمنا أجره ولا

---

١ /( أحكام الجنائز: ١٥٩)

تــضلنا بعــده [١]) واتــه : ئــەی خودایــە.. لــە زیندووەکانمانو مردووەکانمانو ئامادەبووەکانمانو ئامادەنەبووەکانمانو بچوکەکانمانو گـەورەکانمانو نێرەکانمانو مێیـەکانمان خۆشبە، ئـەی خودایـە.. ئـەو کەسـەی لـە ئێمـە دەیـژێنیت ئـەوا لـە سـەر ئیسلامەتی بیژێنەو ئەوەی دەیمرێنێت ئەوا لە سەر ئیمان بیمرێنە، ئەی خودایە بێ بـەشمان مەکـە لـە پاداشتەکەیو لە پاش ئەو گومڕامان مەکە.

٣٦٩- عن سعيد بن المسيب قـال: صـليت وراء أبي هريرة على صبي لم يعمل خطيئة قـط، فـسمعته يقـول : اللـهم اعـذه مـن عـذاب القـبر. [٢] واتــه : لـە

١ / (صحيح ابن ماجه : ١٥٢٠)

٢ /(هداية الرواة، إسناده صحيح : ١٦٣١)

(سعید) کوڕی (المسیب)ەوە دەڵێت: لە پاش (أبو هریرە)وە نوێژم کرد لە سەر منداڵێك هەرگیز تاوانی نەکردبوو، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: ئەی خودایە لە سزای ناو گۆڕ بیپارێزە.

٣٧٠- کان أبوهریرة إذا صلى على الطفل یقول: اللهم اجعله لنا سلفاً وفرطاً وأجراً.[١] واتە: أبو هریرە ئەگەر نوێژی لەسەر منداڵێك بکردبایە ئەوا دەیفەرموو: ئەی خودایە بیکەیتە پاشکەوتی باش‌و پاداشتێکی پێشکەوتوو پاداشت بۆمان.

٣٧١- والسقط یصلى علیه، ویدعى لوالدیه بالمغفرة والرحمة[٢]. واتە: لەبارچوویش نوێژی لە

---

١ /(أحكام الجنائز : ١٦٠/١٦١)، (مختصر البخاري : ٣٩٠/١ عن الحسن بإسناد صحيح)

٢ /(صحيح الجامع : ٣٥٢٥)(صحيح أبي داود : ٢١٨)

سەر دەکرێتو دوعا بە دایكو باوکی دەکرێت کە خوای گەورە لێیان خۆشبێتو رەحمیان لێ بکات.

## ١٣١- دعاء دخول الميت القبر

## پاڕانەوەی ئەو کاتەی کە مردووەکە دەخرێتە ناو گۆڕەکەیەوە

٣٧٢- بسم الله وبالله و على سنة رسول الله أو على ملة رسول الله [١]. واتە : بە ناوی خواو پشت بە خواو لە سەر سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، یان لە سەر میللەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

٣٧٣- الميت إذا وضع في قبره فليقل الذين يضعونه حين يوضع في اللحد : باسم الله وبالله وعلى

---

١ /(صحيح أبي داود : ٣٢١٣) (أحكام الجنائز :١٩٢)

ملـة رسـول الله [١].واتـە : ئەگـەر مـردوو خرایـە نـاو گۆڕەوە با ئەو کەسەی کە دەیخاتە نـاو گۆڕەکـەوە بلێـت : بـە نـاوی خـواو پـشت بـە خـواو لـە سـەر میللەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

٣٧٤- بـسم الله وفي سـبيل الله وعلـى ملـة رسـول الله.[٢] واتة : بە ناوی خواو لە پێناوی خواو لـە سـەر میللەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

## ١٣٢- الدعاء بعد الدفن

## پاڕانەوەی پاش ناشتنی

٣٧٥- استغفروا لاخيكم وسلوا له التثبيـت فانـه الآن يُسأل[١]. واتـە: داوای لێخۆشـبوون بۆ براکـەتان

١ /(أحكام الجنائز :١٩٣)

٢ /(صحيح ابن ماجه :١٥٧٢)

بکەنو داوای دامەزراوی بۆ بکەن چونکە ئێستا ئەو پرسیاری لێ دەکرێت.

قال الشيخ – رحمه الله – التلقين المعروف اليوم لا يصح فيه حديث، والعمل به بدعة، ولا يرد هنا ما اشتهر من القول بالعمل بالحديث الضعيف في فضائل الأعمال، فإن هذا محله فيما ثبت مشروعيته بالكتاب أو السنة الصحيحة، وأما ما ليس كذلك فلا يجوز العمل فيه بالحديث الضعيف، لأنه تشريع ولا يجوز ذلك بالحديث الضعيف، لأنه لا يفيد إلا الظن المرجوح اتفاقاً، فكيف يجوز العمل بمثله ؟ فلينتبه لهذا من أراد السلامة في دينه. ا هـ [٢]. واتە : شەیخ

---

١ /(صحيح أبي داود ٣٢٢١)

٢ /(الضعيفة تحت رقم : ٥٩٩)

— رحمەتی خوای لێ بێت — فەرموویەتی : ئەو تەلقینەی ئەمڕۆ هەیە هیچ فەرموودەیەکی (صحیح)ی لە سەر نەهاتووەو کار کردن پێی بیدعەیە وە لێرەدا نابێت کار بکرێت بەوەی کە دەڵێن : فەرموودەی (ضعیف) دەکرێت کاری پێ بکرێت لە کردەوە باشەکاندا، چونکە ئەمە جێگەیەکە دەبێت تەنها کار بە قورئان یان فەرموودە (صحیح)ەکان بکرێت، بەڵام ئەگەر ئەوە نەبوو ئەوا کار بە فەرموودەی (ضعیف) ناکرێت، چونکە ئەوە دانانی شەرعەو ئەمەش بە فەرموودەی (ضعیف) نابێت، چونکە هیچ سوودی نییە ئیللا گومانی پەسەندکراو نەبێت بە یەکدەنگی زانایان، جا چۆن دەبێت کار بە وێنەو

هاوشـێوەکەی بکرێـت ؟ جـا ئـەو کەسـەی کـە سەلامەتی دەوێت لـە دینەکەیدا ئـەوا بـا ئاگـای لـە خۆی بێت.

## ١٣٣- دعاء التعزية
## نزاو پاڕانەوەی تەعزیٚ

٣٧٦- إن لله مـا أخـذ ، ولله مـا أعطـى ، وكـل شـيء عنـده إلى أجـل مـسمى فلتـصبر ولتحتـسب[١].

واتـە: هـەموو ئـەوە هـی خوایـە کـە بردیـەوە، وە هەموو ئەوەی کە دەیبەخشیٚ هـەر هـی خوایـە، وە هـەموو شتێك لای ئـەو بـە ئەجـەلێکی دیاریکراوە، بۆیە ئارام بگرەو چاوەڕێی پاداشت لە خوا بکە.

---

١ /(أحكام الجنائز : ٢٠٦، ٢٩٧)

## ١٣٤- دعاء زيارة المقابر
## پاڕانەوەی سەردانی گۆڕستان

٣٧٧- السلام عليكم أهل الديار ، من المؤمنين و المسلمين، وإنا إن شاء الله بكم لاحقون أنتم لنا فرط، ونحن لكم تبع، أسأل الله لنا ولكم العافية[١] .

واتە: سڵاوتان لێبێت ئەی خاوەن خانەکان -ئەهلی ئەم گۆڕستانە- لە ئیمانداران و موسڵمانان، وە ئێمەیش بە ویستی خوا پێتان دەگەین، ئێوە بۆ ئێمە پێشکەوتوون - دەستپێشخەرن- ئێمەش بۆ ئێوە شوێنکەوتەین، داوا لە خوا دەکەم لە ئێمەو ئێوە ببورێت و بمانپارێزێت.

١ / (صحيح الكلم الطيب : ١٢٣)، (أحكام الجنائز : ٢٤٠)

٣٧٨- سلام على أهل الديار من المؤمنين و المسلمين، ويرحم الله المستقدمين منا والمستأخرين، و إنا إن شاء الله بكم لاحقون[١]. واته: سڵاوتان لێبێت ئەی خاوەن خانەکان -ئەهلی ئەم گۆڕستانە- لە ئیمانداران‌و موسڵمانان، خوا بەزەیی بە پێشکەوتووو دواکەوتووەکانماندا بێتەوەو ئێمەیش بە ویستی خوا پێتان دەگەین.

٣٧٩- السلام عليكم أهل دار قوم مؤمنين، وإنا وإياكم وما توعدون غداً مؤجلون، وإنا إن شاء الله بكم لاحقون، اللهم اغفر لأهل بقيع الغرقد[٢]. واته: سڵاوتان لێبێت ئەی خاوەن خانە ئیماندارەکان

---

١ /(مختصر مسلم : ٤٩٧)

٢ /(أحكام الجنائز :٢٣٩)

(ئـەهلی ئـەم گۆڕسـتانە)،وە ئێمـەو ئێـوەو ئـەوەی بەڵێنتان پێ دراوە بۆ سبەینی دواخـراوە، ئێمـەیش بە ویستی خوا پێتـان دەگـەین، ئـەی خودایـە.. لـە مردووەکانی گۆڕستانی (بقیع الغرقد) خۆشبە.

قال الشيخ – رحمـه الله – : وأمـا قـراءة القـرآن عند زيارتها فمما لا أصل له في السنة، بل الأحاديـث المـذكورة تـشعر بعـدم مـشروعيتها، إذ لـو كانـت مشروعة لفعلـها رسـول الله (ﷺ) وعلمهـا أصـحابه. ا هــ.[1] شـەیخ – ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت – فەرموویـەتی : خوێندنـەوەی قورئـان لـە کـاتی سەردانی گۆڕستان یەکێکـە لـەو شتانەی کـە هـیچ بنەمایـەکی نییـە لـە سـوننەتدا، بـەڵکو ئـەو

---

١ /(أحكام الجنائز : ٢٤١)

فەرموودانـــەی هـــاتوون لـــە ڕێگایانـــەوە بـــۆت دەردەکـەوێت کـە دروسـت نییـە، چـونکە ئەگـەر دروست بوایە ئـەوا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەیکـردو هاوەڵانی فێر دەکرد.

## ١٣٥- صلاة ركعتين لمن أراد السفر
## ئەنجامدانی دوو ڕکات نوێژ بۆ ئەو کەسەی دەیەوێت سەفەر بکات

٣٨٠- إذا خرجـت مـن منزلـك، فـصل ركعـتين يمنعانـك مـن مخـرج الـسوء، وإذا دخلـت إلى منزلـك فـصل ركعـتين يمنعانـك مـن مـدخل الـسوء[١]. واتـە: ئەگەر لە ماڵ دەرچوویت، ئەوا دوو ڕکات نوێـژ بکـە چـیتر لـە خراپـەی دەرچـوون دەتپـارێزیو ئەگـەر

---

١ /(الصحيحة : ١٣٢٣)

چوويتە ژوورەوە بۆ ماڵەکەی خۆت ئەوا دوو رکات نوێــژ بکــە چــیتر دەتپــارێزی لــە خراپــەی هاتنــە ژوورەوە.

قال الشيخ – رحمـه الله– : إنـه قـد تـوفر ثلاثـة أحاديث في الصلاة عند السفر، فهل يمكـن الاسـتدلال بذلك على مشروعية هذه الـصلاة ؟ فـالجواب : نعـم، فإن حديث أبي هريرة وحده ينهض لإثبات الـشرعية فكيف إذا انضم إليه الحديث المرسل. اهـ[١]. واتـه : شەیخ – رەحمەتی خوای لێبێـت – فەرموویـەتی : سێ فەرموودە هاتووە لە بارەی نوێژی سەفەرەوە، ئایـا دەکرێـت بکرێتـە بەڵگـە بـۆ دروسـتبوونی ئـەم نوێژە ؟ وەڵامەکـە : بـەڵێ، چـونکە فەرموودەکـەی

١ /(الضعيفة:١٣/٥١٢)

(أبو هريرە) بە تەنها دەکرێت بکرێتە بەڵگە بۆ دروستبوونی ئەم نوێژە، ئەی چۆنە ئەگەر فەرموودەیەکی دیکەی (مرسل) ی هاتە پاڵ ؟

## ١٣٦-صلاة ركعتين لمن قدم من السفر

## ئەنجامدانی دووركات نوێژ بۆ کەسێك لە سەفەر گەڕابێتەوە

٣٨١- كان النبي (ﷺ) قلما يقدم من سفر سافره إلا ضحى، وكان قدم من سفر بدأ بالمسجد، فيركع فيه ركعتين[1]. واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەمجار ئەگەر لە سەفەرێك کە کردبووی دەگەڕایەوە ئیللا لە چێشتەنگاودا نەبێ، وە ئەگەر لە سەفەرەکەی بگەڕایەتەوە لە مزگەوتەوە دەستی پێ دەکردو دوو رکات نوێژی تێدا دەکرد.

---

١ /(مختصر البخاري : ١٨٣٣)

٣٨٢- قال النبي (ﷺ) لجابر : (ادخل - أي المسجد - فصل ركعتين)[١]. واتە :پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە (جابر) ی گوت : بچۆ ژوورەوە - واتە :بۆ مزگەوت- دوو ركات نوێژ بكە.

## ١٣٧- دعاء المقيم للمسافر

٣٨٣-أستودع الله دينك وأمانتك وخواتيم عملك[٢]. واتە : دینو سپاردەو كۆتایی كارەكانت بە خوا دەسپێرم.

٣٨٤- زودك الله التقوى ، وغفر ذنبك ويسر لك الخير حيثما كنت [٣]. واتە : خوای گەورە تەقوات بە

---

١ /( مختصر البخاري : ٩٩٠)

٢ /(الصحيحة : ١٤، ٢٤٨٥)

٣ /(صحيح الكلم الطيب : ١٢٦)

تویٚشوو بکاتو لە تاوانەکانت خۆش بێتو چاکەت بۆ سووکو ئاسان بکات لە هەر کوێیەك ببیت.

٣٨٥- اللهم اطو له البعد، وهون عليه السفر[١].

واتە : ئەی خودایە.. دووری بۆ نزیك بکەرەوەو گەشتەکەی بۆ سووکو ئاسان بکەرەوە.

## ١٣٨- دعاء المسافر للمقيم

## پاڕانەوەی گەشتیار بۆ نیشتەجێ

٣٨٦- أستودعُكم الله الذي لا تضيع ودائعه[٢].

واتە : ئەتانسپێرم بەو خوایەی کە سپاردەکان بزر ناکات.

---

١ /(الصحيحة : ١٧٣٠)

٢ /(صحيح الكلم الطيب : ١٣٣)

## ١٣٩- دعاء ركوب الدابة

## پاڕانەوەی سوار بوونی ولاغ یان هەر ئامێری گواستنەوە

٣٨٧- بسم الله -ثلاثا- فلما استوى على ظهرها قال: الحمد لله، ثم قال: ((سبحان الذي سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين وإنا إلى ربنا لمنقلبون)). ثم قال: الحمد لله -ثلاثاً-، ثم قال : الله أكبر -ثلاثاً-، ثم قال : سبحانك إني قد ظلمت نفسي فاغفر لي فإنه لا يغفر الذنوب إلا أنت، ثم ضحك[1].)

واته : بە ناوی خوا (سێ جار) کاتێك لە سەر پشتی -ولاخەکە- جێگیر بوو فەرمووی : سوپاس و ستایش بۆ خوا، ئەمجار فەرمووی : (پاکی و

---

١ /(صحيح الترمذي : ٣٤٤٦)

بێگــەردی بــۆ ئــەو کەســەی کــە ئەمــەی بــۆ ڕەخساندووینو ئێمە دەسەڵاتمان نەبوو بە سەریدا، وە ئێمــە بــۆ لای پــەروەردگارمان دەگەڕێینــەوە) ئەمجار فەرمووی : سوپاسو ستایش بۆ خـوا (سـێ جار) ئەمجار فەرمووی : خوا لـە هـەموو گـەورەترە (سێ جار) ئەمجار فەرمووی : پـاکیو بێگـەردی بۆ تۆیـە ئـەی خوایـە، مـن ستەمم لـە خـۆم کـرد، لـە تاوانەکانم خۆشبە، هیچ کەسێك لە تاوانەکان خۆش نابێت تەنها تۆنەبێت) ئەمجار پێکەنی.

## ١٤٠- الدعاء إذا عثرت الدابة أو ما يقوم مقامها

٣٨٨- عـن أبـي المليح عـن رجـل قـال : كنـت رديــف الــنبي (ﷺ) فعثــرت دابــةٌ، فقلــت، تعــس الشيطان ! فقال : لا تقـل تعـس الشيطان ! فإنـك إذا

قلت ذلك، تعاظم حتى يكون مثل البيت ويقول : بقوتي، ولكن قل : بسم الله، فإنك إذا قلت ذلك تصاغر حتى يكون مثل الذباب.[1] واتە : لە (أبو المليح) ەوە ریوایەت کراوە ئەویش لە کابرایەکی ترەوە گوتی : لەسەر وڵاخێك لە پشتی پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) سوار بووم، وڵاخەکەی سەرسمیدا، منیش گوتم : شەیتان چارەڕەش بێتو تیابچێت، ئەویش فەرمووی : مەڵێ شەیتان چارەڕەش بێتو تیابچێت، چونکە ئەگەر تۆ وا بڵێیت ئەوا ئەو گەورە دەبێت تاوەکو بە قەد خانوویەکی لێ دێتو دەڵێت : بە هێزی خۆم.. بەڵکو بڵێ : بە ناوی خوا، چونکە ئەگەر تۆ وات گوت ئەوا ئەو بچووك دەبێتەوە تاوەکو بە ئەندازەی مێشێکی لێدێت.

---

١ /(صحيح أبي داود : ٤٩٨٢)

## ١٤١- دعاء السفر

## پاڕانەوەی سەفەر

٣٨٩- كان النبي (ﷺ) إذا استوى على بعيره خارجاً إلى سفر كبَّر ثلاثاً، ثم قال : سبحان الذي سخَّر لنا هذا وما كُنَّا له مقرنين وإنا إلى ربنا لمنقلبون. اللهم إنا نسألُكَ في سفرنا هذا البرَّ والتقوى، ومن العمل ما ترضى، اللهم هون علينا سفرنا هذا واطو عنا بعده، أنت الصاحب في السفر، والخليفة في الأهل، اللهم إني أعوذ بك من وعْثاءِ السفر، وكآبة المنظر والحور بعد الكور ودعوة المظلوم وسوء المنقلب في المال والأهل. وإذا رجع قالهن وزاد فيهن: آيبون، تائبون، عابدون، لربنا

حامدون. فلم يزل يقولها حتى دخل المدينة)[1] واتە : ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە سەر پشتی – ولاخەکە – جێگیر بوایە بە مەبەستی دەرچوون بۆ سەفەر ئەوا سێ جار (الله أكبر)ی دەکرد، ئەمجار دەیفەرموو : پاکیو بێگەردی بۆ ئەو کەسەی کە ئەمەی بۆ رەخساندووینو ئێمە دەسەلاتمان نەبوو بە سەریدا، وە ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە) ئەی خودایە..ئێمە لەم گەشتەماندا داوای چاکەو تەقوات لێدەکەینو داوای کارێکت لێدەکەین خۆت پێی رازی بیت، ئەی خودایە.. ئەم

---

١ /(تخريج الكلم الطيب:١٧٤)، (صحيح النسائي:٥٥١٣)،( مختصر البخاري : ١٢٣٤).

گەشتەمان بۆ سووكو ئاسان بكەو دوورییەکەیمان بۆ نزیك بكەرەوە، ئەی خودایە.. تۆ ئاگات لێمانە لە گەشتەکەمانداو پارێزەری کەسوکارمانی کە جێمان هێشتوون، خوایە پەنات پێ ئەگرم لە نارەحەتی گەشتو غەمباریو ناسۆری دیمەنەکانو خراپیو نوقسانی لە دوای باشی زیادە،و لە پاڕانەوەی ستەم لێکراوو خراپ گەڕانەوە بۆ ناو کەسو کارو ماڵو سامان) وە ئەگەر بگەڕایەتەوە ئەوەی دەگوتو ئەمەشی بۆ زیاد دەکرد (گەڕاینەوەو تەوبەکارینو تەنها خوا دەپەرستینو بۆ پەروەردگارمان سوپاسگوزارین.) جا بەردەوام ئەوەی دەگوت تاوەکو دەچووە ناو شارەوە.

## ١٤٢- التكبير على المرتفعات والتسبيح عند الهبوط

## وتنى (الله أكبر) لە سەربەرزاییەکانو (سبحان الله) لە کاتی هاتنەخوارەوەدا (دابەزیندا)

٣٩٠- كان رسول الله وأصحابه إذا علوا الثنايا – المرتفعات من الطرق – كبَّروا، وإذا هبطوا سبَّحوا)[١]

واتە : پێغەمبەری خوا(ﷺ)و هاوەڵانی ئەگەر – لە گەشتەکەیاندا– بەرەو بەرزایی بچوایەن لە رێگادا ئەوا (ألله أكبر)یان دەکرو ئەگەر بەرەو نزمایی بچوایەن ئەوا (سبحان الله) یان دەکرد.

---

١ /(صحيح الكلم :١٤)

## ١٤٣- دعاء دخول القرية أو البلدة إذا أراد دخولها
## پاڕانەوەی کەسێك ئەگەر بیەوێت بچێتە ناو گوندێکەوە یانِ شارێکەوە

٣٩١- اللهم رب السموات السبع وما أظلت ، ورب الأرضين السبع وما أقلت ، ورب الشياطين وما أضلت، ورب الرياح وما ذرت، أسألك خيرها وخير ما فيها و أعوذ بك من شرها، وشر ما فيها)[١] واتە: ئەی پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکانو ئەوەی سیبەری بۆ کردوونو پەروەردگاری حەوت زەوی ئەوەی لە سەری هەلگرتوونو پەروەردگاری شەیتانەکانو ئەوەی گومڕای کردوونو پەروەردگاری باو ئەوەی بلاوەی پێ کردوون، داوای چاکەو خەیریت لێ

---

١ /(الصحيحة : ٢٧٥٩)

دەکەمو چاکەیو خەیری ئەوەی تێیدایەو پەنا پێ دەگرم لە خراپەیو خراپەی ئەوەی تێیدایە.

## ١٤٤-الدعاء لمن نزل منزلا في سفر أو غيره

## پاڕانەوەی کەسێك ئەگەر لەسەفەرەکەیدا لە جێگایەك یان ماڵێك لایدا

٣٩٢- من نزل منزلاً ثم قال: أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق. لم يضره شيء حتى يرتحل من منزله ذلك.) واتە : هەر کەسێك چووە ماڵێك (لە ماڵێك یان جێگایەك لایدا)و ئەمجار گوتی: (پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوا لە خراپەی هەموو ئەوانەی کە دروستی کردووە) ئەوا هیچ شتێك زیانی پێناگەیەنێت تاوەکو ئەو ماڵە بە جێ دەهێڵێ)[1]

---

١ /(مختصر مسلم : ١٤٥٩)

## ١٤٥- دعاء المسافر إذا أسحر

## پاڕانەوەی گەشتیار ئەگەر سەحەری بە سەردا هات

٣٩٣- سمَّع سامع بحمد الله وحُسنِ بلائه علينا ، ربنا صاحبنا وأفضل علينا عائذاً بالله من النار)[١]

واتە : گوێکرێك گوێی لێبوو (شایەتێك شایەتی دەدات) بۆ ئەوەی ئێمە سوپاسی خودا دەکەینو سوپاسی خۆشیو چاکی نیعمەتەکانی دەکەین، پەروەردگارا بمانپارێزەو فەزڵو نیعمەتەکانی خۆت بەردەوام بڕژێنە بە سەرمانداو – لە کاتێکدا ئەمە دەڵێم – پەنام گرتووە بە خوا لە ئاگر.

---

١ /(الصحيحة : ٢٦٣٨)

## ١٤٦- دعاء الرجوع من السفر

## پاڕانەوەی گەڕانەوە لە سەفەر

٣٩٤- كان إذا قفل من غزو أو حجّ أو عمرة، يكبر على كل شرف من الأرض ثلاث تكبيرات ثم يقول: لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك، وله الحمد، وهو على كل شئ قدير، آيبون إن شاء الله، تائبون، عابدون، ساجدون لربنا حامدون، صدق الله وعده، و نصر عبده، و هزم الأحزاب وحده)[١] واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر لە جەنگێك یان حەجێك یان عەمرەیەك بگەڕایەتەوە ئەوا لە هەموو بەرزاییەك سێ جار(الله أكبر)ی دەكردو ئەمجار دەیفەرموو: هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت، تەنهاو بێ هاوەڵە،

---

١ /(مختصر البخاري : ٨٣٥)

مولْكو سوپاسو ستایش تەنها بۆ ئەوەو توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە،گەڕاینەوە -انشاء الله- تەوبەکارینو تەنها خوا دەپەرستینو سوژدەی بۆ دەبەینو بۆ پەروەردگارمان سوپاسگوزارین، خوای گەورە بەڵێنەکەی جێ بەجێکرد-بە سەرخستنی دینەکەی-و بەندەکەی خۆی سەرخست -مەبەستی خۆیەتی- هەر خۆی شکستی بە هەموو حیزبەکان هێنا.

## ١٤٧- النهي عن تمني لقاء العدو
## نەهیکردن لە ئاوا تخواستنی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن

٣٩٥- يا أيها الناس لا تمنوا لقاء العدو سلوا الله العافية فإذا لقيتموهم فاصبروا)[1] واتە: ئەی خەڵکینە.. هەرگیز خۆزگە بە ڕووبەڕووبوونەوەی

---

١ /(مختصر البخاري : ١٣٢٢)

دوژمن مەخوازن و داوا لە خوا بکەن بتانپارێزی، جا ئەگەر ڕووبەڕوویان بوونەوە ئەوا ئارام بگرن.

## ١٤٨- ما يقال عند لقاء العدو

## چی دەگوترێت لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا

٣٩٦- اللهم مُنزل الكتاب ومجري السحاب – سريع الحساب– وهازم الأحزاب اهزمهم وزلزلهم وانصرنا عليهم)[1] واتە : ئەی خودایە دابەزێنەری قورئان و ڕەوێنەری هەورەکان و خێرای لە لێپرسینەوەداو ئەی تێکشکێنەری گرووپەکان، تێکیان بشکێنە و زەوی لە ژێر پێیان بلەرزێنە و ئێمە سەربخە بە سەریاندا.

---

١ /(مختصر البخاري : ١٣٢٢)

## ١٤٩- سؤال الشهادة في سبيل الله

## داواكردنی شەهیدبوون لە پێناوی خوادا

٣٩٧- من سأل الله تعالى الشهادة بصدق بلغه الله منازل الشهداء وإن مات على فراشه)[١] واتە : هەركەسێك بە ڕاستی داوای شەهیدبوونی لە خوای بەرزو پیرۆز كرد ئەوا خوای گەورە دەیگەیەنێتە پلەوپایەی شەهیدان جا هەرچەندە لەسەر جێگاكەی خۆی بمرێت.

## ١٥٠- صفة التلبية

## چۆنییەتی تەلبیەكردن

قال الشيخ – رحمه الله – : ثم يستقبل القبلة قائماً، ثم يلبي بالعمرة أو بالحج والعمرة. شەیخ –

---

١ / (مختصر مسلم : ١٠٧٨)

ڕەحمەتی خوای لێبێت– فەرموویەتی : ئەمجار بە ڕاوەستاوی ڕوو دەکاتە قیبلەو دەست بە تەلبیەکردن دەکات بۆ عەمرە یان حەج و عەمرە.

٣٩٨ – ویقول : اللهم هذه حجة لا رياء فيها ولا سمعة.)[1] واتە : دەڵێت : ئەی خودایە.. ئەمە حەجێکە نە ڕیای تێدایەو نە بۆ ناوبانگییە.

٣٩٩– ويلبي بلتبية النبي (ﷺ): لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، إن الحمد والنعمة لك والملك، لا شريك لك) وكان لا يزيد عليها.واتە : هەروەکو وەڵامدانەوەی(تلبیە)کەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەلبیە دەکات : خوایە وەڵامی دوای وەڵام دەدەمەوە لە گوێڕایەڵیدا، وەڵامت دەدەینەوە هیچ هاوبەشێکت نییەو وەڵامت دەدەینەوە، هەموو

---

١ /(الصحيحة : ٢٦١٧)

سـوپاسو نیعمـەتو موڵکێـك بـۆ تۆیـە، هـیچ هاوەڵێکت نییە.

٤٠٠- وكـان في تلبيتـه (ﷺ): لبيـك إلـه الحـق - لبيـك -.)[1] واتـە: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لـە تەلبیەکەیدا دەیفەرموو: وەڵامت دەدەینەوە ئەی خودای حەقو ڕاستی - وەڵامت دەدەینەوە -.

والتـزام تلبيتـه (ﷺ) أفـضل، وإن كانـت الزيـادة عليها جـائزة لإقـرار الـنبي (ﷺ) النـاس الـذين كـانوا يزيـدون. واتـە: وەدەسـت گـرتن بـە تەلبیەکـەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) باشترو چاکترە، هەرچـەندە ئـەو زیادانـەی لـە سـەری کـراوە دروسـتە چـونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ڕازی بووە لەو کەسانەی زیادیان کردووە.

---

١ /(الصحيحة : ٢١٤٦)، (صحيح الجامع : ٥٠٥٧)

٤٠١– وكان ابن عمر يزيد فيهـا : لبيـك وسـعديك والخير بيديك والرغباء إليك والعمل. ا هـ)[١] واته : ابن عومەر ئەم ویردەی بۆ زیاد دەكردو دەیفەرموو : خوایە وەڵامی دوای وەڵامدانەوەم هەیە بۆت لە گوێرایەڵیتداو شوێنكەوتنی دوای شوێنكەوتنم هەیە بۆ دینەكەت, خەیرو خۆشی وبە دەستی تۆیەو ئومێدو هیواو كاری چاك بۆ تۆیە)

## ١٥١- الدعاء عند رؤيته الكعبة

## پاڕانەوە لە كاتی بینینی كەعبەی پیرۆز

شەیخ –رەحمەتی خوای لێبێت– دەڵێت :

٤٠٢– فإذا رأى الكعبة رفع يديه إن شاء، لثبوتـه عن ابن عبـاس. واتـە : ئەگـەر كەعبـەی بـینی ئـەوا

١ /(مناسك الحج والعمرة : ١٦ – ١٧)

هەردوو دەستی بەرز دەکاتەوە – ئەگەر ویستی–، چونکە دەست بەرزکردنەوە لە ئیبن عەباسەوە هاتووە.

ولم يثبت عن النبي (ﷺ) هنا دعاء خاص، فيدعو بما تيسر له، وإن دعا بدعاء عمر (ﷺ) : واتە : وە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) لێرەدا پاڕانەوەیەکی تایبەت لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) نەهاتووە، جا هەر دوعایەك دەکات ئەوا با بیکات، وە ئەگەر ویستی بە دوعاکەی عومەر دوعا بکات ئەوا با بیکات.– کە دەڵێت – :

٤٠٤– اللهم أنت السلام، ومنك السلام، فحينا بالسلام) فحسنٌ، لثبوته عنه ا هـ)[1] واتە : ئەی

---

١ /(مناسك الحج والعمرة : ٢٠)

خودایــە.. هــەر تــۆ ســەلامو ئاشــتیتو ســەلامو ئاشتیش لە تۆوەیەو بـە سـەلامو ئاشـتی بمانژێنـە) ئـەوا چـاکە چـونکە لـە ئـەوەوە هـاتووەو ریوایـەت کراوە.

## ١٥٢- الذكر عند الحجر الأسود
## زیکرەکانی لای بەردەرەشەکە

قال الشيخ – رحمه الله – : ويسن التكبير عند الحجـر الأسـود في كـل طوفـة.واتـە : شـەيخ – رەحمەتی خوای لێبێت – دەفەرموێت : سوننەتە لای بـەردە رەشـەکە (الله أكـبر) بکـات لـە هـەموو سووڕانەوەیکدا

٤٠٥ – لحديث ابن عباس قال : طاف النبي (ﷺ) بالبيت على بعيره، كلما أتى الركن أشار إليه بشيء

كان عنده وكبر. واتــه: لەبـەر فەرموودەكـەی (ابـن عبـاس) كـه دەڵێـت: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) تـەوافی دەكرد به دەوری كەعبەدا به سەر حوشترەكەیەوە، جا هەر كاتێك دەگەیشته گۆشـەكه وئیـشارەتی بـه شتێك كه پێی بوو بۆ دەكردو (الله اكبر)ی دەكرد.

٤٠٦- وأما التسمية، فإنما صح عن ابن عمـر أنـه كـان إذا اسـتلم الحجـر قـال : بـسم الله والله أكـبر. ا هـ.)[١] واتە : بەڵام نـاوی خـوا هێنـان ئەوا لـه ئـیبن عومەرەوە به (صحیح)ی ریوایەت كراوە كـه ئەگـەر دەستی له بەردە ڕەشەكه بدایه دەیفـەرموو: (بـسم الله والله أكبر).

١ /(حجة النبي (ﷺ) : ٥٧)

## ١٥٣- الذكر في الطواف
## زیکرکانی کاتی تەواف

٤٠٧- ما أطيبك وأطيب ريحك،ما أعظمك وأعظم حرمتك.)[١] واتە : چەند پاكو جوانیو چەندە بۆنت خۆشە ! چەند مەزنیو حورمەتت چەند مەزنە !

## ١٥٤- الدعاء بين الركن اليماني والحجر الأسود
## نزاو پاڕانەوەی نێوان روكنی یەمانیو بەردە رەشەكە

٤٠٨- ربنا آتنا في الدنيا حسنةً، وفي الآخرة حسنةً، وقنا عذاب النار.)[٢] واتە : پەروەردگارا... لە دونیاو دوارۆژدا چاكەمان پێ ببەخشەو لە سزای ئاگر بمانپارێزە.

---

١ /(تراجع العلامة : ٨٩)

٢ /( صحيح أبي داود : ١٦٥٣)

## ١٥٥- الذكر عند مقام ابراهيم
## زیکرکانی لای (مقام ابراهیم)

٤٠٩- فقـرأ: ﴿واتخـذوا مـن مقـام إبـراهيم مصلى﴾، ورفع صوته يسمع الناس،فجعل المقام بينه وبين البيت فصلى ركعتين، فقرأ فيهما بـ{قل هو الله أحد}،و{قل يا أيها الكافرون}[1] واتـه : ئـەو ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێت : ﴿واتخذوا من مقام إبراهيم مصلى﴾، وە دەنگی بەرز کردەوە بۆ ئەوەی خەڵکی گوێبیستی بێت، ئەمجار (مقام) ی خستە نێوان خۆیو کەعبە (بیت)و دوو رکات نوێژی کردو لە نوێژەکاندا هەردوو سورەتی (الاخلاص)و (الکافرون) ی تێدا خوێندەوە.

---

١ /. (حجة النبي(ﷺ) :٥٨)

## ١٥٦-الدعاء عند شرب ماء زمزم
## پاڕانەوەی کاتی خواردنەوەی ئاوی زەمزەم

٤١٠-ماء زمزم لما شرب له)[١] واته : ئاوی زەمزەم بۆ ئەوەیە کە بۆی دەخۆرێتەوە (واته : ئەگەر بە مەبەستی شیفا بیخۆیت ئەوا خوا شیفات دەداتو ئەگەر بە مەبەستی پەناگرتن بیخۆیت ئەوا خوا پەنات دەدات...هتد)

٤١١-خیر ماء علی وجه الأرض ماء زمزم، فیه طعام الطعم وشفاء السقم)[٢] واته : باشترینو چاکترین ئاو لە سەر رووی زەویدا ئاوی زەمزەمە، خۆراکی خواردنو شیفای نەخۆشی تێدایە.

---

١ /(صحیح الترغیب:١١٦٤)

٢ /(صحیح الترغیب: ١١٦١)

## ١٥٧-الدعاء على الصفا والمروة
## پاڕانەوە لەسەر صەفاو مەروە

٤١٢- خرج النبي (ﷺ) إلى الصفا فلما دنا من الصفا قرأ ﴿إن الصفا والمروة من شعائر الله، فمن حج البيت أو اعتمر فلا جناح عليه أن يطوف بهما، ومن تطوع خيراً فإن الله شاكر عليم﴾، نبدأ بما بدأ الله به، فبدأ بالصفا فرقى عليه، حتى رأى البيت - الكعبة - فاستقبل القبلة، فوحد الله، وكبره ثلاثاً: (الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر وقال : لا إله إلا الله وحده لا شريك له ،له الملك وله الحمد يحيي ويميت، وهو على كل شيء قدير، لا إله إلا الله وحده لا شريك له، أنجز وعده، ونصر عبده، وهزم الأحزاب وحده، يقول ذلك - ثلاث مرات - ويدعو

بين ذلك – أي بين التهليلات بما شاء من الدعاء بما فيه خير الدنيا والآخرة – ثم يفعل على المروة كما فعل على الصفا.)[١] واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەرچوو بۆ صەفا، کاتێ نزیك بووەوە لە صەفا ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێت: ﴿إن الصفا والمروة من شعائر الله، فمن حج البيت أو اعتمر فلا جناح عليه أن يطوف بهما، ومن تطوع خيراً فإن الله شاكر عليم﴾ ئێمەش بەوە دەستی پێ دەکەین کە خوای گەورە دەستی پێکردووە، بۆیە بە صەفا دەستی پێکردو چووە سەری‌و تاوەکو کەعبەی بینی، ئەمجار رووی لە کەعبە کردو خوای گەورەی بە تاك راگرت‌و سێ جار الله اكبر ی کرد (الله اكبر،

١ /(صفة حجة النبي (ﷺ) ٥٩–٦٠)، ( مناسك الحج : ٢٤–٢٥)

الله اكـبر، الله اكـبر) ئـەمجار فـەرمووی: هـیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت تـەنها (الله) نەبێت، تەنهاو بێ هاوەڵە، موڵكو سوپاسو ستایش تـەنها بـۆ ئـەوەو هـەر ئـەو زینـدوو دەكاتـەوەو دەمرێنێتو توانای بە سەر هەموو شتێكدا هەیە، هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت تـەنها (الله) نەبێت، تەنهاو بێ هاوەڵە، بەڵێنەكانی جێبەجێ كردو بەندەكانی خۆی سەرخستو بە تەنها هەموو كۆمەڵو گرووەكانی شكاند، سێ جار ئەوەی دەگوتـەوەو لـە نێوانیـدا دەپاڕایـەوە، واتـە لـە نێـوان تەهلیلەكانـدا بەوەی ویستی لێبێت لـە پاڕانـەوە، ئـەوەی خـەیری دونیاو دوارۆژی تێدا بێـت – ئـەمجار ئـەوەی كـە لـە سـەر صـەفا كـردی لـە سـەر مـەروەش دووبـارەی دەكردەوە.

## ١٥٨ – الدعاء في السعي

## پاڕانەوە لە کاتی (سەعی)دا

٤١٣– وإن دعا في السعي بقوله : رب اغفر وارحم، إنك أنت الأعز الأكرم، فلا بأس لثبوته عن جمع من السلف.)[١] واتە : ئەگەر لە (سعی)دا پاڕانەوەی بەو دوعایە : (پەروەردگارا... لێم خۆشبەو بەزەییت پێمدا بێتەوە، هەر تۆ بە عیززەتترین‌و بەڕێزترین کەسیت) ئەوا دروستە لە بەر ئەوەی لە کۆمەڵێك لە پێشینەوە هاتووە.

## ١٥٩- الدعاء يوم عرفة

## پاڕانەوە لە ڕۆژی عەرەفەدا

٤١٤– أفضل ما قلتُ أنا والنبيون عشية عرفة : لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد،

---

١ / (مناسك الحج:٢٧)

وهو على كل شيء قدير)[١] واتە : باشترین نزاو پاڕانەوە كە منو پێغەمبەران لە ئێوارەی عەرەفەدا وتومانە ئەمەیە : هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت، تەنهاو بێ هاوەڵە، موڵكو سوپاسو ستایش تەنها بۆ ئەوەو توانای بە سەر هەموو شتێكدا هەیە.

## ١٦٠- الدعاء عند المشعر الحرام

## پاڕانەوە لای (المشعر الحرام)

٤١٥- ثم ركب النبي(ﷺ) القصواء حتى أتى المشعر الحرام، فرقى عليه فاستقبل القبلة، فحمد الله وكبره وهلله ووحده، ولا يزال كذلك حتى يسفر جداً)[٢]. واتە : پێغەمبەری خوا(ﷺ) سواری

---

١ /(الصحيحة : ١٣١٣)

٢ /(حجة النبي (ﷺ) : ٧٦)

حوشترەکەی بوو (کە ناوی القصواء بوو) تاوەکو گەیشتە (المشعر الحرام) وئەمجار سەرکەوتە سەری‌و رووی کرد لە قیبلەو دەستی کرد بە (الحمد لله)و (الله اکبر)و (لا اله الا الله)و بە تاکدانانی خوا، ئا بەو شێوەیە مایەوە تاوەکو خۆر زۆر زەرد بوویەوە.

## ١٦١- التكبير عند رمي الجمار (الحصاة) وتنی (الله أكبر) لە كاتی فرێدانی بەردەكاندا

٤١٦- كان يرمي الجمرة الدنيا (التي تلي مسجد منى) بسبع حصيات، يكبر على إثر كل حصاة، ثم يتقدم حتى يسهل، (أي يقصد السهل الأرض) فيقوم مستقبل القبلة، فيقوم طويلاً، ويدعو ويرفع يديه، ثم يرمي (الجمرة) الوسطى (فيرميها بسبع حصيات يكبر كلما رمى بحصاة) ثم يأخذ ذات

الشمال فيستهل ويقوم مستقبل القبلة فيقوم طويلاً ويدعو ويرفع يديه ويقوم طويلاً ثم يرمي جمرة ذات العقبة، من بطن الوادي (فيرميها بسبع حصيات، يكبر عند كل حصاة) ولا يقف عندها ثم ينصرف)[١]

## ١٦٢- صفة التكبير في أيام العيدين

## چۆنییەتی (الله أكبر) كردن لە ڕۆژانی جەژندا

٤١٧- كان ابن عباس يكبر فيقول : الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله،ء الله أكبر، الله أكبر، ولله الحمد)[٢] واتە : ابن عباس تەكبیراتی دەكردو دەیفەرموو : الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله، و الله أكبر، الله أكبر، ولله الحمد.

---

١ /(مختصر البخاري : ٨١٦)

٢ /(الإرواء : ١٢٥)

٤١٨- عن ابن مسعود أنه كان يكبر أيام التشريق : الله أكبر، الله أكبر، ولله الحمد)[١] واته : له (ابن مسعود)ەوە هاتووە كەوا له ڕۆژانی (التشريق) بەم شێوەیە تەكبیراتی دەكرد : الله أكبر، الله أكبر، ولله الحمد.

٤١٩- كان رسول الله (ﷺ) يخرج في العيدين رافعاً صوته بالتهليل والتكبير)[٢]. واته : پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ڕۆژانی جەژندا دەردەچووو دەنگی بەرز دەكردە بە (لا إله إلا الله)و (ألله أكبر).

قال الشيخ - رحمه الله - : وفي الحديث دليل على مشروعية التكبير جهراً في الطريق إلى المصلى.. ومما يحسن التذكير به بهذه المناسبة، أن الجهر

---

١ /. (الإرواء : ١٢٥)

٢ /( صحيح الجامع : ٤٩٣٤)

بالتكبير هنا لا يشرع فيه الاجتماع عليه بصوت واحد كما يفعله البعض وكذلك كل ذكر يشرع فيه رفع الصوت أو لا يشرع، فلا يشرع فيه الاجتماع المذكور.. ا هـ.)[1] واته : شەیخ – ڕەحمەتی خوای لێبێت – فەرموویەتی : فەرموودەکە بەڵگەیە لە سەر درووستبوونی دەنگ بەرز کرنەوە بە (الله اكبر) لە ڕێگادا بەرەو نوێژگە، هەروەها ئەوەی باشە لەم بۆنەیەدا بهێنرێتە یادو باس بکرێت ئەوەیە، کەوا بە یەك دەنگو بە کۆمەڵ دروست نییە تەکبیرات بکرێت هەروەکو چۆن هەندێ کەس ئەنجامی دەدەن، هەروەها هەموو زیکرێك دروست بێت دەنگی تێدا بەرز بکرێتەوە یان دروست نەبێت، ئەوا ئەو کۆبوونەوە ناوبراوەی تێدا دروست نییە.

---

١ /(الصحيحة ١/٣٣١)

## ١٦٣- التهنئة يوم العيد

## پیرۆزبایی کردن لە یەکتر لە ڕۆژی جەژندا

٤٢٠-كان أصحاب النبي (ﷺ) إذا التقوا يوم العيد يقول بعضهم لبعض: تقبل الله منا ومنك)[١]

واتە: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر لە ڕۆژانی جەژندا بە یەك بگەیشتایەن ئەوا هەندێکیان بە هەندێکی تریان دەفەرموو: خوا لە ئێمەو ئێوەی قبوڵ بکات.

## ١٦٤-الذكر عند ذبح الأضحية

## ئەو زیکرانەی لە کاتی سەربڕینی قوربانیدا دەگوترێت

٤٢١- ذبح النبي (ﷺ) يوم الذبح كبشين اقرنين أملحين موجأين فلما وجهها قال: ﴿إني وجهت

---

١ /( تمام المنة : ٣٥٤)

وجهـي للـذي فطـر الـسموات والأرض – علـى ملـة ابـراهيم– حنيفـاً ومـا أنـا مـن المـشركين ﴾، ﴿إن صلاتي و نسكي ومحياي ومماتي لله رب العـالمين لا شريك له، وبذلك أمـرت وأنـا أول المـسلمين﴾، اللـهم منك ولك.. باسـم الله و الله أكـبر – اللـهم تقبـل مـني ومن أمة محمد–(ﷺ) ﴾[1]

واتـه : پێغەمبەری خوا(ﷺ) لـه ڕۆژی سـەربڕیندا (جـەژنی قوربـان) دوو بـەرانی شـاخداری بـازووی (ڕەشو سپی) ی خەسێنراوی سەربڕی، کاتێ ڕووی کرد لە قیبلە فەرمووی: ﴿إنـي وجهـت وجهـي للـذي فطر السموات والأرض – على ملـة ابـراهيم– حنيفـاً ومـا أنـا مـن المـشركين ﴾، ﴿إن صـلاتي و نـسكي

---

١ /(صحيح أبي داود : ٢٤٩١)

ومحياي ومماتي لله رب العالمين لا شريك لـه، وبـذلك أمرت وأنا أول المسلمين﴾ ئەی خودایـە.. ئەمـە لـە تۆوەیەو بۆ تۆیـە، بـە نـاوی خـواو خـوا لـە هـەموو گەورەترە – ئـەی خودایـە.. لـە مـنو لـە ئوممـەتی موحەممەدی قبوڵ بکە.

قال الشيخ – رحمه الله– : ويقول عنـد الـذبح أو النحر : (بسم الله، و الله أكبر، اللهم إن هذا منـك ولـك اللهم تقبل مني.)[1] واتە : شەیخ – رەحمەتی خـوای لێبێـت – فەرموویـەتی : لــە كــاتی ســەربڕیندا دەفەرموێت : بسم اللهو الله أكبر، ئەی خودایە ئەمـە لە تۆوەیەو بۆ تۆیە، ئەی خودایە لێم وەرگرە.

١ /(مناسك الحج:٣٤)

## ١٦٥- الاجتهاد في الدعاء
## تێکۆشان لە پاڕانەوەدا

٤٢٢- قال (ﷺ): أتحبون أن تجتهدوا في الدعاء؟ قولوا: اللهم أعنا على شكرك وذكرك و حسن عبادتك)[١] واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ئایە پێتان خۆشە تێبکۆشنو تەقەلابکەن لە پاڕانەوەدا؟ بڵێن: ئەی خودایە، یارمەتیمان بدەو هاوکاریمان بکە لەسەر سوپاسگوزاریو جوانو چاك پەرستنت.

## ١٦٦- دعاء الله باسمه الأعظم
## پاڕانەوە لە خوا بە ناوە مەزنەکەی

٤٢٣-((أن النبي (ﷺ) سمع رجلاً يقول: اللهم لك الحمد، لا إله إلا أنت وحدك لا شريك لك، المنان،

---

١ /(الصحيحة:٨٤٤)

بـديع الـسموات والأرض، ذا الجـلال والإكـرام فقـال النبي (ﷺ): لقد سألت الله باسم الله الأعظم، الذي إذا دعـيَ بـه أجـاب، وإذا سـئل بـه أعطـى.))[١] واتـه: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) گـوێی لـێ بـوو كابرايـەك دەيگوت: ئەی خودايە..سوپاس‌و ستايش تەنها بۆ تۆيە.. هـيچ پەرسـتراوێك نييـە شايـستەی پەرسـتن بێـت جگـە لـە تـۆ، تـەنهاو بـێ هاوەڵيـت خـاوەنی منەت‌و فەزڵێ، هـەر تـۆ بەديهێنـەری ئاسمانـەكان‌و زەويت، هەر تۆ خـاوەنی پايەبـەرزی‌و شـكۆمەندی‌و رێزيت)) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فـەرمووی: تـۆ داوات لە خوا كرد بـە نـاوە مەزنەكەيـەوە (الاسـم الأعظـم) ئەو نـاوەی كـە ئەگـەر پێـی بپاڕێيتـەوە ئـەوا وەڵام

---

١ /(الصحيحة :٣٤١١)

دەدرێیتـــەوەو ئەگـــەر داوای پـــێ بکـــەیت ئـــەوا دەدرێتی.

٤٢٤- أن الـنبي (ﷺ) سمـع رجـلاً يقـول : اللـهم إني أسألك بأني اشـهد أنــك لا إلـه إلا أنـت ، الأحـد الصمد الـذي لم يلـد و لم يولـد ، و لم يكـن لـه كفـواً أحد ، فقال النبي (ﷺ): لقد سـألت الله بالاسـم – في رواية : باسمـه الأعظـم- الـذي إذا سـئل بـه أعطـى وإذا دعـي أجـاب.))[1] واتـە: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) گوێی لە کابرایەك بوو دەیگوت : ئەی خودایە.. مـن داوات لێ دەکەم بەوەی کە من شـایەتی دەدەم کـە هیچ پـەرستراوێك جگە لە تۆ نییە شایەنی پـەرسـتن بێت، تـەنهاو جێی نیازو مەبەستی، ئەو کەسەی کـە

---

١ /( صحيح الموارد : ٢٣٨٣)

کەست لێ نەبووەو لە کەسیش نەبووی، هیچ کەسێك هاوشێوەی تۆ نییە..پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : تۆ داوات لە خوا کرد بە ناوەکەی — وە لە ریوایەتێکدا هاتووە بە ناوە مەزنەکەی (الاسم الأعظم) — ئەو ناوەی کە ئەگەر داوای پێ بکەیت ئەوا دەدرێتی وئەگەر پێی بپاڕێیتەوە ئەوا وەڵام دەدرێیتەوە.

قال الشيخ –رحمه الله– : واعلم أن العلماء اختلفوا في تعيين اسم الله الأعظم على أربعة عشر قولاً، وساقها الحافظ في (الفتح) وذكر لكل قول دليله. وأكثرها أدلتها من الأحاديث، وبعضها مجرد رأي لا يلتفت إليه، ومن تلك الأحاديث منها الصحيح، ولكنه ليس صريح الدلالة، ومنها الموقوف

کهذا، ومنها الصریح الدلالة وهو قسمان : قسم صحیح صریح وهو حدیث بریدة : ((الله لا إله هو الأحد الصمد الذي لم یلد...)) وقال الحافظ : وهو أرجح من حیث السند ومن جمیع ما ورد في ذلك)[١].

واتە: شەیخ – ڕەحمەتی خوای لێبێت – فەرموویەتی : ئەوەش بزانە کەوا زانایان جیاوازن لە دیاری کردنی ناوە مەزنەکەی خوا (الاسم الاعظم) بۆ چواردە بۆچوون، هەر هەموو ئەوانە ابن حجر لە (الفتح)دا باسی کردوونو بۆ هەر یەکەو بەڵگەی خۆی هێناوەتەوە، وە زۆربەی بەڵگەکانیان لە فەرموودەوەیە، وە هەندێکیان تەنها بۆچوونەو

١ / قال الشیخ – رحمه الله – : وهو کما قال رحمه الله، وأقره الشوکاني في (تحفة الذاکرین. ٥٢) اهـ.

بایەخی پێ نادرێت، وە لەو فەرموودانە تێیاندا هەیە (صحیح) ە بەڵام بەڵگەیەکی ئاشکراو دیار نییە، وە تێیاندا هەیە لە هاوڵانەوە هاتووە – هەروەکو ئەم فەرموودەیە– وە تێیاندا هەیە ئاشکراو روونە ئەوانیش دوو بەشن : بەشێکیان فەرموودەی (صحیح) ی ئاشکران وەکو فەرموودەکەی (بریدە) : ((الله لا إله هو الأحد الصمد الذي لم يلد...)) ابن حجر دەفەرموێت : ئەمەیان لە هەموو پەسەندترە لە رووی سەنەدەوەو لە هەموو ئەوانەی کە دەربارەی هاتوون.

## ١٦٧- سؤال الله الجنة والاستجارة من النار
## (داوا کردنی بەهەشت لە خوای گەورەو خۆدانە پاڵی بۆ ئەوەی لە ئاگر بیپارێزی)

٤٢٥-ما استجار عبد من النار سبع مرات في يوم إلا قالت النار : يا رب إن عبدك فلاناً قد استجارك مني فأجره ولا يسأل الله عبد الجنة في يوم سبع مرات إلا قالت الجنة : يا رب عبدك فلاناً سألني فأدخله الجنة.)[1] واتە : هەر کاتێك بەندەیەك لە ڕۆژێکدا حەوت جار داوای پەنا بکات لە خوا کە بیپارێزێت لە ئاگر، ئیللا ئاگر دەڵێت : ئەی پەروەردگارا.. فلان بەندەی تۆ خۆی داوەتە پاڵ تۆ بۆ ئەوەی لە من بیپارێزی، بۆیە خوایە

---

١ /(الصحيحة : ٢٥٠٦)

بیپارێزە، هەر کاتێك لە ڕۆژێکدا بەندەیەك حەوت جار داوای بەهەشت بکات لە خوا، ئیللا بەهەشت دەڵێت : ئەی پەروەردگارا.. فلان بەندەی تۆ داوای بەهەشتت لێدەکات، بۆیە بیخەرە ناو بەهەشتەوە)

## ١٦٨- الترغيب في الاستغفار

## ( هاندان بۆ داوای لێخۆشبوون و ئیستغفارکردن )

٤٢٦–عن النبي (ﷺ) قال : قال إبليس : وعزتك لا أبرح أُغوي عبادك ما دامت أرواحهم في أجسادهم فقال : وعزتي وجلالي، لا أزال أغفر لهم ما استغفروني.)[1] پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ئیبلیس گوتویەتی : سوێند بە عیززەتی تۆ – ئەی خوا – من بەردەوام بەندەکانت گومڕا دەکەم

---

١ /(صحيح الترغيب : ١٦١٧)

تاوەکو ڕۆح وا لە جەستەیاندا، - خوای گەورە -ش فەرمووی : سوێند بە عیززەتو شکۆمەندیم.. منیش بەردەوام لێیان خۆش دەبم تاکو ئەوان داوای لێخۆشبوونم لێبکەن)

٤٢٧- قال الله : يا ابن آدم إنك ما دعوتني ورجوتني، غفرت لك ما كان منك، ولا أبالي، يا ابن آدم لو بلغت ذنوبك عنان السماء، ثم استغفرتني غفرت لك، ولا أبالي، يا ابن آدم إنك لو أتيتني بقراب الأرض خطايا ثم لقيتني لا تشرك بي شيئاً، لأتيتك بقرابها مغفرة.)[1] واتە: خوا گەورە فەرموویەتی : ئەی نەوەی ئادەم ! تۆ هەر کاتێك هاوارم پێ بکەیتو داوام لێ بکەیتو تکام لێ بکەیت ئەوا لێت

---

١ /(صحيح الترمذي : ٣٥٤)

خۆش دەبم هەرچی شتێکت کردبێ هیچ باکم نییە. ئەی نەوەی ئادەم ! ئەگەر تاوانەکانت گەیشتنە ئاسمانەکان ئەمجار داوای لێخۆشبوونت لێ کردم ئەوا لێت خۆش دەبم‌و هیچ باکم نییە، ئەی نەوەی ئادەم ! ئەگەر بە ئەندازەی هەموو زەوی بە تاوانەوە پێم بگەی‌و کاتێ بە من گەیشتی هاوەڵت بۆ من بڕیار نەدابوو ئەوا بە ئەندازەی هەموو زەوی بە لێ خۆش بوونەوەوە پێت دەگەم))

## ١٦٩- الترغيب في الدعاء

## (هاندان بۆ پاڕانەوە)

٤٢٨- إن الدعاء ينفع مما نزل، ومما لم ينزل فعليكم عباد الله بالدعاء.)[1] واتە: دوعاو پاڕانەوە

---

١ /( صحيح الترغيب : ١٦٣٤)

سـوودی هەیـە بـۆ ئـەوەی کـە دابـەزیوەو ئـەوەی دانەبـەزیوە، بۆیـە ئـەوەی لـە سـەرتانە – ئـەی بەندەکانی خوا – پاڕانەوەیە.

٤٢٩– ((إن الله حييٌ كريمٌ يستحي إذا رفع الرجل إليه يديه أن يردهما صفراً خائبتين))[١].واتـە : بـزانن کە خوای گەورە زۆر بەشەرمو بەڕێزە شەرم دەکات کـاتێ کەسێك هـەردوو دەسـتی بـۆ بـەرز بکاتـەوە ئەویش بە بێ ئومێدیو بەتاڵی بیگێڕێتەوە.

٤٣٠– ((ما من مسلم يدعو بدعوة ليس فيها إثـمٌ ولا قطيعة رحم إلا أعطاه الله بها إحدى ثلاث: إما أن يعجل له دعوته، وإما أن يدخرها له في الآخـرة، وإمـا

---

١ / (صحيح الترمذي:٣٥٥٦).

أن يـصرف عنـه مـن الـسوء مثلـها))[١] واتـه: هـيچ موسڵمانێك نييه كه بپاڕێتەوه لـه خـوای گـەوره بـه داواكارييەك كه تاوان و بچڕانی گەیاندنی خزمایـەتی تێـدا نـەبێت ئـيللا خـوای گـەوره بـه هـۆی ئـەو پاڕانەوەوه يەكێ لەم سێ شتەی پـێ دەدات: يـان پاڕانەوەكەی بـۆ گـيرا دەكـات و دوای ناخـات، يـان بۆی هەڵدەگرێ و لـه قيامەتـدا پاداشـتی دەداتـەوه، يان به ئەنـدازەی پاڕانەوەكـەی خراپـەو بـەلای لـێ دوور دەكاتەوه.

---

١ / (صحيح الترغيب : ١٦٣٣).

# ناوەڕۆك

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|